زنجیرە ڕێنمایيەكانی ڕێگای ڕاست ( ٢٩ )



# ڕوناكی سوننەت

## و تاریكییەكانی بیدعە

## لە دیندا

لە ژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا

نوسینی

د. سعيد بن علي بن وهف القحطاني

وەرگێڕانی

م.شاخوان جواد أحمد

زنجیرەی ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست

(٢٩)

# ڕوناکی سوننەت
# و
# تاریکییەکانی بیدعە
# لە دیندا

## لە ژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا

نوسینی :

د. سعيد بن علي بن وهف القحطاني

وەرگێڕانی :

م.شاخوان جواد أحمد

پێش نوێژو وتار خوێنی مزگەوتی (سەید ئەحمەدی فەیلەسوف) / چەمچەماڵ

چاپی یەکەم

١٤٢٩کۆچی-٢٠٠٨زایینی

**ناوی کتێب : ڕوناکی سوننەت و تاریکییەکانی بیدعە لە دیندا...**
**ناوی نووسەر: د. سعيد بن علي بن وهف القحطاني .**
**ناوی وەرگێڕ : م.شاخوان جواد أحمد .**
**ژمارەی سپاردن** : ژمارە ( ٣٤٦)ی ساڵی (٢٠٠٢) پێ دراوە لە لایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە .
**زنجیرە** : زنجیرەی (٢٩) بیست و نۆیەم لە زنجیرەی ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست .
**نۆرە و ساڵی چاپ** : یەکەم ـ (**١٤٢٩ هـ** / ٢٠٠٨) .
**چاپ خانە** : چاپەمەنی سیما / سلێمانی .
**بنکەی بڵاوکردنەوە** :

**کتێبخانەی سوننە ــ سلێمانی .**
**کتێبخانەی زانست ــ کەلار .**
**کتێبخانەی سیما ــ چەمچەماڵ .**

قال الإمام الشافعي رحمهُ الله :

كُلُّ العُلومِ سِوَى القُرآنِ مَشغَلَة      إلاَّ الـحَديثَ وإلاَّ الفقْـهَ في الدِّينِ
العِلمُ ما كانَ فيهِ قال حَدَّثَـنا      وما سِوَى ذَاكَ وَسواسُ الشَّياطيـنِ



**پێشەکی وەرگێڕ:**

موسڵمانی خۆشەویست : سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) پلەو پایەیەکی زۆر بەرزو گەورەی هەیە لە ئیسلامدا، چۆن وانییە لە کاتێکدا دووەم بنچینەی ئایینە پاش قورئانی پیرۆز؟ ڕوون کەرەوەی قورئانی پیرۆزە، دەقە پڕ مانا و گشتگیرو ڕەهاکانی تایبەت و سنوردار دەکات، بەڵێ سوننەت ئەو قەڵا پۆڵاینەیە کە هەر موسڵمانێك بچێتە ناوی کەسێکی ئەمین و هێمن و پارێزراوە، وە ئەو دەرگا گەورەیەیە کە هەر موسڵمانێك بچێتە ناوی دەگات بەمەست و ئاواتەکانی، سوننەت ئەو کەسانەی کە پەیوەستن پێیەوە بەرزیان دەکاتەوە ئەگەر کردەوە چاکەکانیشیان کەم بێت، وە ڕوناکییەکەی لە ناو چاوو بەردەستیاندایە لە دونیاو دوارۆژدا.

موسڵمانی خۆشەویست خوای پەروەردگار فەرمانی پێ کردووین بە گوێڕایەڵی کردنی خۆی و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لە چەندین شوێن لە قورئانی پیرۆزدا، گوێڕایەڵی کردنی خوای پەروەردگار بە شوێن کەوتنی قورئانی پیرۆزە وە گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەر (ﷺ) بە شوێن کەوتنی فەرموودە پیرۆزەکانیەتی، شایەتی دانی هەر کەسێك بەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) نێردراوی خوایە بریتیە لە شوێن کەوتنی و جێبەجێ کردنی سوننەتەکانی، وە خوای پەروەردگار پێی ڕاگەیاندووین کە هەرکەسێك گوێڕایەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بکات ئەوە بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستی بۆ خوای پەروەردگار، وە هەر کەسێك گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) نەکات ئەوە کەسێکی بێباوەڕە یان ئیمان لاوازە.

بۆیە ئەگەر دەتەوێت دینی خوای پەروەردگار بەردەوام دیارو ئاشکراو سەرکەوتوو بێت، ئەگەر دەتەوێت خوای پەروەردگار و فریشتەکان و موسڵمانان خۆشتیان بوێت، ئەگەر دەتەوێت بەڕاستی بیسەلمێنیت کە شوێنکەوتووی

پێشەواو مامۆستاو سەروەری خۆتی کە پێغەمبەرە (ﷺ)، ئەگەر دەتەوێت دڵ خۆش و دڵ ئارام بیت و بەرچاو ڕۆشن بیت، ئەگەر دەتەوێت بەردەوام بیت لەسەر دین و دڵت پەیوەست بێت پێیەوە ئەوە: شوێنی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بکەوەو جێبەجێی بکەو زیندووی بکەوە لە ناو خەڵکیدا (خۆشەویستیت بۆ پێغەمبەر (ﷺ) بەو شێوەیە دەبێت نەك هەر بەدەم بڵێیت خۆشم دەوێت و لەو لاشەوە هیچ گرنگی بە سوننەتەکانی نادەیت).

موسڵمانی خۆشەویست لەبەر گەورەیی سوننەت و بڵاو بوونەوەی بیدعە بە هەموو جۆرو بەش و شێوەیەك بە پێویستم زانی هەستم بە وەرگێڕانی ئەم کیتابە بە سودەی بەردەستت کە باس لە (ڕوناکی سوننەت وتاریکییەکانی بیدعەو شتە تازە داهێنراوەکان لەدیندا) دەکات، بیدعە هەموی سەرلێشێواویە هەروەك چۆن سوننەت هەموی نورو ڕوناکیە، بیدعە سەردەکێشێت بۆ کوفر، بیدعەکردن واتە: شوێن کەوتنی هەواو ئارەزوو دژایەتی کردنی شەرع و لادان لێی، واتە: درۆ هەڵبەستن بۆ خوای پەروەردگار بەبێ عیلم و زانیاری، واتە: ڕق بوون لە سوننەت و کەسانی هەڵگری، واتە: تێگەیشتن لە قورئانی پیرۆز و سوننەت بە پێچەوانەوە، واتە: هەست کردن بە کەم و کوڕی شەریعەت لە لایەن کەسی بیدعەچییەوە (پەنا بە خوای پەروەردگار)، وە کەسانی بیدعەچی پشتیان هەڵکردووە لە یادو زیکری ڕاستەقینەی خوای پەروەردگار، حەق و ڕاستیان لە موسڵمانان کپ کردووە و شاردوویانەتەوە، ئوممەتی ئیسلامیان پارچە پارچە کردووە، کەسانی بیدعەچی خۆیان خستۆتە ئاستی شەرع دانەرەوە و خۆیان چواندووە بە خوای پەروەردگار لە شەرع داناندا، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار فەرمانی بە کردنی ئەو کارە نەکردووە (بەڵکو هەندێ جار ڕێگریشی لێ کردووە) بەڵام کەسانی بیدعەچی گوێ بە فەرمانی خوا نادەن و ئەو کارە دەکەن، بیدعە کردن واتە: هەست کردن بە خیانەتی پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵانی بەڕێزی (رضـي الله

عنهم) و سەرجەم زانایانی شارەزاو خەم خۆرو دین پەروەر، یان کەم تەرخەمی کردنیان لە گەیاندن و ڕوون کردنەوەی ئەم دینە (پەنا بە خوای پەروەردگار)، چۆن دەشێت کارێك بکرێت لە کاتێکدا فەرمانی خوای پەروەردگار و پێغەمبەرو (ﷺ) ووتەی زانایانی لەسەر نەبێت، موسڵمانی خۆشەویست ئەمانە هەموویان خراپەو زیانی بیدعەن، ئایا پاش ئەمە بۆ هیچ موسڵمانێك هەیە واز لە فەرمان و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بێنێت و ڕوو بکاتە بیرو بۆ چون ووتەی زانایان (یان هەندێك لە کەسانی بەناو زانا)؟

ئایا ووتەو فەرمان و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە پێشترە بۆ موسڵمانی ڕاستەقینە یان بۆ چونی کەسانی تر؟

بۆیە موسڵمانی خۆشەویست کاتێك ئەم کیتابە دەخوێنیتەوە بە چاوی موسڵمانی ڕاستەقینەو دادپەروەرانەوە بڕوانە بابەت و بەڵگەکانیان، هەرکاتێك بابەتێکت بینی پێچەوانەی قورئانی پیرۆز و سوننەت بوو (هەمو بابەتەکان لەسەر بەڵگەی قورئانی پیرۆزو سوننەت و ووتەی زانایان باس کراوە) وەری مەگرە، بەڵکو وازی لێ بێنەو پشت گوێی بخە، بەڵام ئەگەر وانەبوو ئەوە بۆت نییە پێچەوانەی بکەیت ئەگەر خۆت بە ئیمانداری ڕاستەقینە و شوێن کەوتووی پێغەمبەر (ﷺ) دەزانیت.

موسڵمانی خۆشەویست ئەم کیتابە تانەو تەشەرە نییە لە هیچ کەس و کۆمەڵ و گروپێك، بەڵکو دیاری کردن و ڕوون کردنەوەی گەورەیی سوننەت و خراپەو تاوانی بیدعەیە، ئەو بیدعەیەی کە ئەمڕۆ لەناو موسڵماناندا بووە بە سوننەت و سوننەت بووە بە بیدعە، ئەوەندەی بیدعە دەکرێت سوننەت ناکرێت و گرنگی پێ نادرێت، وە ئەگەر ئینکاری و نکۆڵی لێ بکرێت دەوترێت: دین گۆڕاوە، خۆشەویستی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) نەماوە!!

موسـلّمانی خۆشەویـست بـاش ئاگاداربـەو بزانـە بـە هـیچ شـێوەیەك هێـزو دەسەلاّت ئیسلام ناگەڕێتـەوەو موسـلّمانان سـەركەوتوو نـابن بـە بیدعـە كـردن و شتی پڕو پوچ كە لە دیندا نییە، بۆیە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا دەبینیت زۆر كەس بـە ناو زاناو بانگەوازكارو خـەم خـۆر بـۆ ئیسلام كەوتوونەتـە نـاو چـەندین بیدعـەی خراپ و گومڕاكەر، بەڵكو بانگەوازیشی بۆ دەكەن، بۆیە موسڵمانی ئەهلی سوننەو جەماعەو سوننەت لە دڵا خۆشەویست پێویستە لەسـەرت كـە موسـلّمانان ئاگـادار بكەیتەوە لـەو هـەموو بیدعـەو خراپەیـەی كـە لـەم ڕۆژگـارەدا لـەناو موسـلّماناندا بلاّوەو بانگەوازی بۆ دەكرێت.

لە كۆتاییدا لە خوای پەروەردگار دەپاڕێینـەوەو دەڵـێین: ﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ ﴿٨﴾ ﴾

✍ : م. شاخەوان جەواد ئەحمەد

پێش نوێژو وتـار خوێنی مزگەوتی ( سەید ئەحمەدی فەیلەسوف )



## * پێشەكی دانەر :

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَستَعِيْنُهُ وَنَستَغْفِرُهُ وَنَعُوْذُ باللهِ مِن شُرُوْرِ أنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ .

وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ، صلى الله عليه وعلى آله وأصحابه ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين، وسلم تسليماً كثيراً ، أَمَّا بَعْدُ ...

موسوڵمانی خۆشەویست : ئەم نامیلكەیەی بەردەستت نامیلكەیەكی كورت و پوختە سەبارەت بە ﴿ڕوناكی سوننەت و تاریكییەكانی بیدعە و شتە تازە داهێنراوەكان لە دیندا لە ژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا﴾ كە تێیدا تێگەیشتن لە مانای سوننەتم باس كردووە، وە ناوەكانی ئەهلی سوننەم ڕوون كردۆتەوە، كە سوننەت بە گشتی نیعمەتێكی یەكجار گەورەو پڕ لەبەرەكەتە، وەتێیدا گەورەیی و پلەو پایەی سوننەت و گەورەیی و پلەو پایەی كەسانی پەیوەست بە سوننەت و نیشانەكانیانم ڕوون كردۆتەوە، وە تێیدا باسی بیدعەو كەسانی بیدعەچی و تێگەیشتن لە ماناو واتای بیدعەو مەرجەكانی گیرابوون و قەبوڵ بوونی كردەوە چاكەكانم كردووە، وە هەروەها باسی خراپەو سەرزەنشتی بیدعە لە دیندا و هۆكارەكانی دەركەوتنی بیدعەو بەشەكانی و حوكمەكانیم كردووە، وە باسی ئەو جۆرە بیدعانەی كە لەسەر گۆڕەكان دەكرێت و جگە لەو شتانەشم كردووە، وە ئەو بیدعەو كارە تازە داهێنراوانەی كە لەم سەردەمەدا دەكرێن و

نۆر بڵاون باسیانم کردووه، وه باسی حوکمی تەوبەی بیدعەچی و شوێنەواره خراپەکانی بیدعەم کردووه .

موسوڵمانی خۆشەویست ئەوەی کە هیچ گومانی تێدا نییە ئەوەیە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ژیان و ڕووناکییەیە کە سەرفرازی و بەختەوەری و هیدایەتی بەندەی موسوڵمانی تێدایە، وه ئەو کەسانەی کە پەیوەستن بە سوننەتەوە بەرزو ڕێزداریان دەکات ئەگەر کردەوەشیان کەم بێت، ﴿ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ﴿١٠٦﴾ ﴾ (آل عمران: ١٠٦) .

واتە: لەو ڕۆژەدا "کە ڕۆژی قیامەتە" کەسانێك دەم و چاویان ڕەش دەبێت و کەسانێك دەم و چاویان سپی و ڕووناك و درەوشاوە دەبێت.

إبن عباس (رضي الله عنهما) فەرمویەتی: دەم و چاوی کەسانی پەیوەست بە سوننەت سپی و ڕووناك و درەوشاوە دەبێت، دەم و چاوی کەسانی بیدعەچی و پارچە پارچە گەریەکان ڕەش هەڵدەگەرێت[1] .

کەسی پەیوەست بە سوننەت دڵی ڕۆشن و زیندووە، وه مل کەچە بۆ خوای پەروەردگار و شوێنی پێغەمبەر (ﷺ) کەوتووە بەلاشەو بە دڵی (لە ڕووکەش و ناوەوەیدا شوێنی سوننەت کەوتووە)، بەڵام کەسی بیدعەچی دڵی تاریك و مردووە، تاریکی سەرتاپای داپۆشیون : دڵەکانیان تاریکە کارەکانیان تاریك و سەرلێشێواوییە، بۆیە هەرکەسێك خوای پەروەردگار بیەوێت سەرفرازو بەختەوەری بکات لەو تاریکییانەوە دەری دەکات بۆ ڕووناکی سوننەت[2] .

ئەم نامیلکەیەم کردۆتە دوو بەشەوە، هەر بەشەی چەند باسێکی لە خۆ گرتووە بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

---

[1] إبن القيّم لە کیتابی (إجتماع الجيوش الإسلامية على غزو المعطلة والجهمية، ٢/٣٩) باسی کردووە.

[2] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو: ٢/٣٨ – ٤١.

۞ **بەشی یەكەم:** ڕوناكی سوننەت:

باسی یەكەم: تێگەیشتن لە مانای سوننەت.

باسی دووەم: ناوەكانی كەسانی پەیوەست بە سوننەت (أسماء أهل السنة).

باسی سێ یەم: سوننەت نیعمەتێكی گشتی و ڕەهایە.

باسی چوارەم:گەورەیی و پلەو پایەی بەرزی سوننەت.

باسی پێنجەم: گەورەیی و پلەو پایەی بەرزی كەسانی پەیوەست بە سوننەت، وە شوێنی كەسانی بیدعەچی.

۞ **بەشی دووەم:** تاریكییەكانی بیدعەو تازە داهێنراوەكان لە دیندا:

باسی یەكەم: تێگەیشتن لە مانای بیدعە.

باسی دووەم: مەرجەكانی گیرابوون و قەبوڵ بوونی كردەوە چاكەكان.

باسی سێ یەم: سەرزەنشت و خراپەی بیدعە لە دیندا.

باسی چوارەم: هۆكارەكانی دروست بوون و سەرهەڵدانی بیدعە.

باسی پێنجەم: بەشەكانی بیدعە.

باسی شەشەم: حوكمی بیدعە لە دیندا و جۆرەكانی.

باسی حەوتەم: جۆرەكانی ئەو بیدعانەی كەلەسەر گۆڕەكان دەكرێن.

باسی هەشتەم: بیدعە باوو بڵاوەكانی ئەم سەردەمە.

باسی نۆیەم: تەوبە كردنی كەسی بیدعەچی.

باسی دەیەم: زیان و شوێنەوارە خراپەكانی بیدعە.

داواكارم لە خوای گەورە ئەم كارە پیرۆزە تەنها لەبەر خاتری ئەو بێت، وە سودم پێ بگەیەنێت لە ژیانی دونیاو پاش مردنم، وە سود بە هەموو ئەو كەسانە بگەیەنێت كە ئەگات پێیان، بەڕاستی خوای پەروەردگار باشترین داوا لێكراوە و بەڕێزترین ئومێد پێ بووانە، تەنها هەر ئەو پشتیوانمانە وباشترین پشت پێ بەستراوە، وە سوپاس و ستایش بۆپەروەردگاری هەردوو جیهانیان و سەڵات و

سەلامی خوای پەروەردگار لەسەر بەندەو پێغەمبەری (ﷺ) ڕاستگۆی خۆیی و یارو یاوەران و شوێن کەوتوانیان بە چاکی تارۆژی دوایی بێت .

## ۞ بەشی یەکەم: ڕوناکی سوننەت

### باسی یەکەم: تێگەیشتن لە مانای سوننەت

سوننەت کەسانی هەڵگری خۆی هەیە، وە ئەو کەسانە بیروباوەڕی تەواویان هەیە، وە کۆبونەتەوە لەسەر حەق، بۆیە وا باشە لێرەدا پێناسەی هەر یەك لەم سێ ووشەیە بکەم (عَقيدَةُ أهلِ السُّنَّة والجَماعَة).

**یەکەم: وشەی (العقیدة) لە زمانەوانیدا:** وەرگیراوە لە گرێ لێ دان و بەستن بەیەکەوە بەتوندی، وە بەو مانایە: توندو پتەوو پێوەلکان هاتووە، دەوترێت: عَقَدَ الحَبلَ يَعقِدُه: واتە: پەتەکەی بە توندو تۆڵ و پتەوی بەست، وە دەوترێت: عَقَدَ العَهدَ وَالبَيعَ: واتە: پەیمان و فرۆشتنەکەی توندو تۆڵ و مەحکەم کرد، وَعَقَدَ الإزارَ: بە توندوو تۆڵی بەستی، وَالعَقدُ ضِدُّ الحَلِّ، واتە: گرێ لێ دان و بەستن پێچەوانەی شل بوون و کردنەوەیە[٣].

**وشەی (العقیدة) لە ڕوانگەی شەرعەوە:** بیروباوەڕ بریتی یە لەو ئیمانە پتەوو حوکمە بڕاوەیەی کە هیچ گومانی تێدا نەبێت، وە ئەو ئیمانەیە کە مرۆڤ دڵ و ویژدانی خۆی لەسەر پەیوەست دەکات و دەیکاتە بیروبۆچونێك و دینێك و دینداری پێوە دەکات، جا ئەگەر ئەو ئیمانە پتەوو حوکمە بڕاوەیە ڕاست و دروست بێت ئەوە بیروباوەڕێکی ڕاست و حەق دەبێت وەکو بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعەت، بەڵام ئەگەر باتڵ و ناڕاست بێت ئەوکاتە بیروباوەڕێکی

[٣] **بڕوانە:** لسان العرب لابن منظور باب الباء، فصل العين، ٣ ٢٩٦، والقاموس المحيط للفيروز آبادي، باب الدال، فصل العين، ص٣٨٣، ومعجم المقاييس في اللغة لابن فارس، باب العين، ص٦٧٩

پوچــەڵ و نادروســت دەبێــت وەكــو بیروبــاوەڕی كۆمــەڵ و تاقمــە گــومڕاو سەرلێشێواوەكان[٤].

## ۞ دووەم: تێگەیشتن لە كەسانی پەیوەست بە سوننەت

وشـەی (**السُنّة**) لـە زمانەوانیـدا، واتـە: ڕێگـەو مەزهـەب، جـا ئـەو ڕێگەیـە ڕێگەیەكی باش بێت یان خراپ[٥].

سوننەت لە زاراوەی زانایانی بیروباوەڕی ئیسلامیدا: ئەو ڕێگـەو ڕێبازەیـە كـە پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی بەڕێزی لەسـەری بوونـە: بەزانـست و بیروبـاوەڕێكی تـەواوو ووتـەو كردەوەیـەكی جـوان و ڕێـك، ئـەو سوننەتەیە كـە شـوێن كـەوتنی پێویـستە و كەسـانی شـوێن كـەوتووی سـوپاس كـراون، وەئـەو كەسـانەی كـە پێـچەوانەین سەرزەنـشت كـراون، هـەر بۆیـە ووتـراوە: فـلآن كـەس لـە ئـەهلی سوننەیە، واتـە: كەسـێكە لەسـەر ئـەو ڕێگـا ڕاسـت و دروسـت و ڕێـك و سـوپاس كراوەیە[٦].

زانـای پایـە بـەرز إبن رجـــب (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرمویـەتی: (سـوننەت: ڕێگەیەكی گیراوە بەرە، ئەویش بریتیە لە دەست گرتن بەو مەنهەج و ڕێبازەی كە پێغەمبەر (ﷺ) و خەلیفە بەڕێزو هاوەڵانی بەڕێزی لەسەری بوونە، لە بیروبـاوەڕ و كردەوەو ووتەكاندا، كە ئەوەش بریتیە لە سوننەتی تەواو)[٧].

وە زانای پایە بەرزو شێخی ئیسلام إبن تیمیّة (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرمویەتی:

---

[٤] **بروانە**: مباحث في عقيدة أهل السنة والجماعة، للشيخ الدكتور ناصر العقل ص ٩-١٠.

[٥] **بروانە**: لسان العرب، لابن منظور، باب النون، فصل السين، ١٣/٢٢٥ .

[٦] **بروانە**: مباحث في عقيدة أهل السنة، للدكتور ناصر العقل، ص١٣.

[٧] **بروانە**: جامع العلوم والحكم، ١/١٢٠

(سوننەت بریتیە لەو کارانەی کە بەڵگەی شەرعییان لەسەرە، بەوەی کردنیان گوێڕایەڵی یە بۆ خوای پەروەردگار و پێغەمبەر (ﷺ)، جا ئەو کارە پێغەمبەر (ﷺ) خۆی کردبێتی، یان لەسەردەمی ئەودا کرابێت، یان خۆی نەیکردبێت و لەسەردەمی ئەویشدا نەکرابێت، لەبەر نەبوونی هیچ داخوازیەك بۆ کردنی لەو کاتەدا، یان کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ئەو کارەی نەکردووە ڕێگرێك هەبووە)[٨].

بۆیە سوننەت بەم مانایە بریتیە: (لە شوێن کەوتنی شوێنەوارەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕووکەش و ناوەڕۆکدا (بەلاشەو دڵ و دەروون) وە شوێنکەوتنی ڕێگەو ڕێبازی پێشینانی چاکەکارانی یەکەمین لە کۆچکردووان و پشتیوانان"إتباع سبيل السابقين الأولين من المهاجرين والأنصار")[٩].

## ✪ سێیەم: تێگەیشتن لەمانای الجَماعَة

واتای (الجَماعَة) لە زمانەوانیدا: وەرگیراوە لە بنەڕەت و پێکهاتەی کۆ، کە بنچینەی ئەم ووشەیە دەسوڕێتەوە لە دەوری کۆو کۆبوونەوە کە پێچەوانەی پارچەپارچەییە، إبن فارس (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرمووێت: الجيم والميم والعين، یەك بنچینەن کە بەڵگەیە لەسەر لەگەڵ یەکدا کۆبوونەوەی شتێك، دەوترێت: جَمَعتُ الشَّيَ جَمعًا، واتە: کۆم کردەوەو دامە پاڵ یەك[١٠].

**جەماعەت** لە زاراوەی زانایانی بیروباوەڕی ئیسلامدا: بریتین لە پێشینانی ئەم ئوممەتە: لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) و شوێنکەوتوانیان و ئەوانەی

---

[٨] بڕوانە: مجموع فتاوى ابن تيمية، ٢١/٣١٧.

[٩] بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ٣/١٥٧.

[١٠] بڕوانە: معجم المقاييس في اللغة، لابن فارس، كتاب الجيم، باب ما جاء من كلام العرب في المضاعف والمطابق أوله جيم، ص٢٢٤.

كە شوێنی ئەوان كەوتوون تا ڕۆژی دوایی، ئەو كەسانەی كە كۆبونەتەوە لەسەر حەقی ڕوون و ئاشكرا لە قورئان وسوننەت[١١].

هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) عبد الله كوڕی مسعود (رضي الله عنه) فەرموویەتی: ((الجَماعَةُ ما وافَقَ الحَق وَإن كُنتَ وَحَدَك)).

واتە: جەماعەت ئەوەیە كە لەگەڵ حەقدا بیت ئەگەر بە تەنها خۆتیش بیت.

زانای پایە بەرز نُعَیمي كوڕی حَماد (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرمووێت:

(واتای ووتەكەی عبد الله كوڕی مسعود ئەوە دەگەیەنێت ئەگەر جەماعەت و كۆمەڵی موسوڵمانانت لێشێوا "نەتدەزانی كام كۆمەڵەیان لەسەر حەقن" دەست بگرە بە مەنهەج و ڕێبازی جەماعەت و كۆمەڵی یەكەمی موسوڵمانان پێش تێكچون و پارچە پارچە بوونیان، ئەگەر تەنها خۆت بیت لەو كاتەدا تۆ جەماعەتی بۆ خۆت)[١٢].

### ۞ باسی دووەم: ناوو سیفاتەكانی ئەهلی سوننە

١ ـ أهلُ السُّنَّة والجَماعَة، واتە: كەسانی پەیوەست بە سوننەت و كۆمەڵی ڕاستەقینەی موسوڵمانان، ئەوانیش ئەو كەسانەن لەسەر هەمان ڕێبازو مەنهەجی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هاوەڵانین، ئەوانەی كە دەستیان گرتووە بە سوننەتەكانی پێغەمبەری خواوە (ﷺ)، ئەوانیش هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) و شوێنكەوتوانیان و زانایانی ڕێنمونی كارن، ئەو كەسانەی كە پابەند بوونە بە شوێن كەوتنی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) و دوور كەوتونەوە لە بیدعەو شتە تازە داهێنراوەكان لە دیندا لەهەر شوێن و كاتێكدا بوو بێتن،

---

[١١] بڕوانە: شرح العقيدة الطحاوية، لابن أبي العز، ص٦٨، وشرح العقيدة الواسطية لابن تيمية، تأليف العلامة محمد خليل هراس، ص٦١.

[١٢] بڕوانە. إغاثة اللهفان، ١ / ٧٠، ذكره الإمام ابن القيم وعزاه إلى البيهقي.

**کەسانێکن دیارو سەرکەوتوون و دەمێننەوە تا ڕۆژی قیامەت[١٣] ، ناو نراون بە ئەهلی سوننە و جەماعەت لەبەر ئەوەی خۆیان داوەتە پاڵ سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) وە کۆو یەکدەنگن لەسەر دەست گرتن پێیانەوە بەلاشەو دڵ و دەروون: لە قسە و کردەوەو بیروباوەڕدا[١٤].**

عَوفِ **کوڕی** مالك (ﷺ): **ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە کە فەرمویەتی:**
((إفترَقَتِ اليَهودُ عَلى إحدَى وَسَبعينَ فِرقَةً فواحِدَةً في الجَنَّة وَسَبعونَ في النّارِ، وافتَرَقَت النَّصارَى عَلى ثِنتَينِ وَسَبعينَ فِرقَة فإحدى وَسَبعينَ فِرقَة في النّارِ وَواحِدَةَ في الجَنَّة. وَالَّذي نَفسُ مُحَمَّد بِيَدِهِ لَتَفتَرِقَنَّ أُمَّتي عَلى ثَلاثٍ وَسَبعينَ فِرقَة، واحِدَةٌ في الجَنَّة واِثنَتانِ وَسَبعونَ في النّارِ، قيلَ: يا رَسولَ الله، مَن هُم؟ قالَ: الجَماعَة))[١٥].

وفي رواية الترمذي عن عبد الله بن عمرو: ((قالُوا: وَمَن هِيَ يا رَسولَ الله؟ قالَ: ما أنا عَلَيه وَأصحابي))[١٦].

**واتە : جولەکە بوون بە حەفتاو یەك بەش و کۆمەڵی جیاواز تەنها یەك کۆمەڵیان (لەسەر حەق بوون) دەچنە بەهەشتەوە وحەفتا کۆمەڵ وگروپە جیاوازەکان دەچنە ئاگری دۆزەخەوە، وە گاورەکان بوون بە حەفتاو دوو کۆمەڵی جیاواز حەفتا و یەك لەو کۆمەڵ وگروپە جیاوازانە دەچنە ئاگری دۆزەخەوە تەنها یەك کۆمەڵیان (کە لەسەر حەق بوون) دەچنە بەهەشتەوە، وە سوێند بێت بەو خوایەی کە ڕوحی منی بەدەستە ئوممەت و شوێن کەوتوانی**

---

[١٣] **بڕوانە:** مباحث في عقيدة أهل السنة والجماعة، للدكتور ناصر بن عبد الكريم العقل، ص ١٣-١٤.

[١٤] **بڕوانە:** فتح رب البرية بتلخيص الحموية، للعلامة محمد بن عثيمين ص ١٠، وشرح العقيدة الواسطية، للعلامة صالح بن فوزان الفوزان، ص ١٠.

[١٥] أخرجه ابن ماجه بلفظه، في كتاب الفتن، باب افتراق الأمم، ٢/٣٢١، برقم ٣٩٩٢، وأبو داود، كتاب السنة، باب شرح السنة، ٤/١٩٧، برقم ٤٥٩٦، وابن أبي عاصم، في كتاب السنة، ١/٣٢، برقم ٦٣، وصححه الألباني في صحيح سنن ابن ماجه، ٢ ٣٦٤.

[١٦] سنن الترمذي، كتاب الإيمان، باب ما جاء في افتراق هذه الأمة، ٥/٢٦، برقم ٢٦٤١.

منيش دەبن بە حەفتاو سێ بەشەوە، كۆمەڵێكيان دەچێتە بەهەشتەوە و حەفتاو دوويان بۆ ئاگری دۆزەخە، ووتــرا: ئـەی پێغەمبـەر (ﷺ) كێن ئـەو كۆمەڵـەی كەدەچنە بەهەشـتەوە؟ فـەرموی: ئـەو كەسـانەن كـە كۆمـەڵی حـەق و ڕاسـتی موسوڵمانان .

وە لە ڕیوایەتێكی تـردا كە ئیمامی الترمــذي لـە عبـداللّٰهی كـوڕی ئیمـامی عومەرەوە (خوایان لـێ ڕازی بێـت) دەیگێڕێتـەوە: هـاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبـەر (ﷺ) ووتـیان: كێن ئەو كۆمەڵە؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ئەو كۆمەڵـەن ئەمڕۆ من و هاوەڵانم لە سەر چـی مەنهەج و ڕێبـازێكین ئـەوانیش لەسـەر هـەمان مەنهەج و ڕێبازن.

كۆمـەڵی ڕزگـار بــوو: بـەڵێ ڕزگـار بـوو لـە ئـاگری دۆزەخ، لەبـەر ئـەوەی پێغەمبـەر (ﷺ) تـەنها ئـەو كۆمەڵـەی جیـاكردەوە لـە نـاو كۆمەڵـە بـەهیلاك چوەكاندا و فـەرموی: ((كلها في النّار إلأ واحــدة))[١٧] هـەموو ئـەو كۆمەڵانـە لـە ئاگری دۆزەخدان تەنها یەكێكیان نەبێت، كە لە ئاگری دۆزەخدا نییە.

كۆمەڵی سەركەوتسوو: معاوية (رضي الله عنه) دەفەرمـوێت: گوێم لـە پێغەمبـەری خـوا بوو (ﷺ) دەیفەرمـوو: ((لا تزال طائفةٌ من أمتي قائمةٌ بــأمر الله لا يــضرُّهم مــن خذلهم أو خالفهم حتى يأتي أمر الله وهم ظاهرون على الناس))[١٨].

واتــە: بــەردەوام كۆمــەڵێك لــە ئوممــەت و شــوێن كــەوتوانی مــن وەســتاون بەفەرمانەكانی خـواو بـەرز ڕایـان گرتـووە، پـشت هـەڵكردنی كەسـانێك لێیـان و پێـچەوانەكردنیان زیانیـان پـێ ناگەیـەنێت تـا ڕۆژی قیامـەت، بـەڵكو بـەردەوام

---

[١٧] بروانە: من أصول أهل السنة والجماعة، للعلامة صالح بن فوزان الفوزان، ص ١١.

[١٨] متفق عليه: البخاري، كتاب المناقب، باب: حدثنا محمد بن المثنى، ٤/٢٢٥، بــرقم ٣٦٤١، ومــسلم بلفظه، في كتاب الإمارة، باب قوله ﷺ: "لا تزال طائفة من أمتي ظاهرين علــى الحــق لا يــضرهم مــن خالفهم" ٢/١٥٢٤، برقم ١٠٣٧.

سەرکەتوو و دیارن لە ناو خەڵکیدا.

وە هەروەها مُعیرة ی کوڕی شعبة (ﷺ)بەهەمان شێوە دەیگێڕێتەوە.

وە ثوبان (ﷺ) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((لا ترال طائفة من أمتي ظاهرين على الحق لا يضرهم من خذلهم، حتى يأتي أمر الله وهم كذلك))[١٩].

واتە: بەردەوام کۆمەڵێك لە ئوممەت و شوێن کەوتوانی من دیارو ئاشکران لەسەر حەق و ڕاستی پشت هەڵکردنی کەسانێك لێیان و دژایەتی کردنیان زیانیان پێ ناگەیەنێت تا قیامەت دێت و لەسەر ئەو حەق و ڕاستییەن.

وە جابری کوڕی عبدالله (رضي الله عنهما) بەهەمان شێوە بۆمان دەگێڕێتەوە[٢٠].

٢ ـ ئەهلی سوننەو جەماعە کەسانێکن دەستیان گرتووە بە قورئان و سوننەت و ئەو مەنهەج و ڕێبازەی کە پێشینانی خۆیان لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) (کۆچکردووان وپشتیوانان) لەسەری بوونە، هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەیان فەرمویەتی: ((ما أنا عليه وأصحابي))[٢١].

واتە: کەسانێکن (کۆمەڵی ڕزگاربوو) لەسەر ئەو مەنهەج و ڕێبازەن کە من و هاوەلانمی لەسەر بووینە.

٣ ـ ئەهلی سوننەو جەماعەت مامۆستاو پێشەنگ و بانگەوازکار و ڕێنمونی کاری خەڵکن بۆ سەر ڕێگای حەق و ڕاستی، وەکار دەکەن بەو حەقەی بە پێیانە، زانای پایە بەرز أَیُّوبُ السّختياني (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت:

---

[١٩] صحيح مسلم، كتاب الإمارة باب قوله ﷺ: ''لا ترال طائفة من أمتي ظاهرين على الحق لا يضرهم من خالفهم'' ١٥٢٣/٢، برقم ١٩٢٠.

[٢٠] صحيح مسلم، كتاب الإمارة باب قوله ﷺ : ''لا ترال طائفة من أمتي ظاهرين على الحق لا يضرهم من خالفهم''، ١٥٢٣/٢، برقم ١٩٢٣.

[٢١] سنن الترمذي، كتاب الإيمان ، باب ما جاء في افتراق هذه الأمة، ٢٦/٥، برقم ٢٦٤١ .

(لەخۆش بەختی و سەرفرازی گەنجی تازە پێگەیشتووی موسوڵمان و كەسانی جگە لەعەرەب ئەوەیە كە خوای پەروەردگار ڕێنمونی كەرو ڕێپیشاندەری بێت بۆ ئەوەی زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعەت بناسێ و فێری دین ببێت لێیانەوە)[٢٢].

وە (فُضیل)ی كوڕی عیاض (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت:

(خوای پەروەردگار كۆمەڵە بەندەیەكی هەیە بەندەكان و وولات پێیان زیندوو دەبێتەوە كە ئەوانیش ئەهلی سوننەو جەماعەن، وە هەركەسێك ژێرو تێگەیشتوو بێت تەنها حەلاڵ دەكاتە ناو سكییەوە (ماڵی حەلاڵ پەیدا دەكات و تەنها حەلاڵیش دەخوات) ئەو كەسە بەڕاستی لە بەندەو كۆمەڵی ڕاستەقینەی خوای پەروەردگارە)[٢٣].

٤ ـ ئەهلی سوننەو جەماعە باشترینی موسوڵمانانن ئینكاری و نكۆڵی دەكەن لە بیدعەو كەسانی بیدعەچی، بە أبوبكری كوڕی عیاش (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ووترا: كێ ئەهلی سوننەیە؟ ئەویش فەرموی: (بەو كەسە دەوترێت كەسێكە لە ئەهلی سوننەیە هەر كاتێك باسی هەواو ئارەزووەكان كرا دەمارگیری نەبێت بۆ هیچ شتێك لەو هەواو ئارەزووانە"واتە: كاتێك ووترا: ئەو كارە بیدعەیە یان شەرعی نییە یان ئەو بۆچونە پێچەوانەی سوننەتە دەرمارگیری نەیگرێت و قسەی كەسانێك نەخاتە پێش قسەی خوای پەروەردگار و پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم)".

بەڵام زۆر جێی داخە زۆربەی ووتەو كرداری موسوڵمانانی ئەمڕۆ نەك هەر پێچەوانەی قورئان و سوننەتن بەڵكو جێ بەجێ كردنی قورئان و سوننەت بە بیر تەسكی و توند ڕەوی دەزانن، یان بۆ چونی پیاوان زاڵ كراوە بەسەر قورئان و

---

[٢٢] بڕوانە: شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة، للالكائي، ١/٦٦، برقم ٣٠.

[٢٣] بڕوانە: شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة، للالكائي، ١/٧٢، برقم ٥١.

سوننەتدا، کاتێك باسی سوننەت دەکرێت دەوترێت: ئاژاوەی تێدایە یان ڕێز لە زانایان ناگیرێت، سوێند بە خوای پەروەردگار جگە لە ئەهلی سوننەو جەماعەت گرنگی بە سوننەت نادەن و بانگەوازی بۆ ناکەن "گەورەترین بەلگەش بۆ ئەمە سەیرکردن و تێڕوانینە بۆ ووتەو کردارو هەڵس و کەوتیان، ئەگەر کەسێك تۆزێك دادپەروەر بێت و وورد ببێتەوە لە حاڵی ئەهلی بیدەع زۆر بە ڕوونی دەبینێت کە ئەوان لە کوێ و سوننەت لە کوێ"، بەڵکو بە پێچەوانەی سوننەت دەجوڵێنەوەو بانگەواز بۆ گەورەترین بیدعە دەکەن کە ئەویش پارچە پارچەیی نێوان موسوڵمانانە، وە زیندوو کردنەوەی چەندین بیدعەی خراپ و سەرزەنشت کراو (کەلەم کتێبەدا باسم کردووە) بە ناوی دەعوەو بانگەواز کردن و گێڕانەوەی حوکمی ئیسلام! دیارە پێغەمبەر (ﷺ) نەیزانیوە دەعوە بکات؟! یان کەم تەرخەم بووە پەنا دەگرین بە خوای پەروەردگار لە بوونی ئەم گومانە خراپە....هتد).

هەروەها زانای پایە بەرز إبن تیمیة (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت:

(ئەهلی سوننە باشترین و مام ناوەندی ترین کەسانی ئەم ئوممەتەن کە لەسەر ڕێگای ڕاستی ئیسلامن: ڕێگەی حەق و ڕاستی و دادپەروەری).

٥ ـ ئەهلی سوننەو جەماعە غەریبن لەناو موسوڵمانان‌دا کاتێك خەڵکی خراپ دەبن، أبو هريرة (ﷺ) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((بَدَأَ الإسلامُ غَرِيبَاً وَسَيَعودُ كَما بَدَأَ غَرِيبَاً، فَطُوبى لِلغُرَباء))[٢٤].

واتە: ئیسلام دەرکەت و سەری هەڵدا بەغەریبی وە ئیسلام دەگەڕێتەوە هەروەك چۆن بە غەریبی سەری هەڵدا و دەرکەوت، بۆیە خۆشبەختی و بەهەشت بۆ ئەو کەسانەی کە غەریبن لە ئیسلامدا (واتە: چەند فەرمانێکی خوای پەروەردگار و پێغەمبەر (ﷺ) جێبەجێ دەکەن کە بەلای زۆربەی

[٢٤] مسلم، كتاب الإيمان، باب بيان أن الإسلام بدأ غريباً وسيعود غريباً، ١/١٣٠، برقم ١٤٥

موسوڵمانانەوە غەریب و نامۆیە).

وە لە ڕیوایەتێكی تردا كە ئیمامی أحمد لە عبداللە ی كوڕی مسعودەوە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە: ((قالَ: قِيلَ: وَمَن الغُرَباء؟ قالَ: النّزاعَ مِنَ القَبائِلِ))[٢٥].

ووترا: غەریبەكان كێن؟ فەرمووی: كەسانێكی دابڕاون لە كەس و كارو عەشیرەتی خۆیان.

وە لە ڕیوایەتێكی تردا كە ئیمامی أحمد لە عبداللە ی كوڕی عمرو كوڕی عاص بۆمان دەگێڕێتەوە، ووترا: غەریبەكان كێن ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی: ((أناسٌ صالحونَ في أناسٍ سُوءٍ كَثير مَن يَعصيهِم أكثر مِمَّن يُطيعُهُم))[٢٦].

واتە: غەریبەكانی ئوممەتی من كەسانێكی چاك و بۆخوا سوڵحاون لەناو كەسانێكی زۆری خراپدا، ئەو كەسانەی كە سەرپێچیان دەكەن و شوێنیان ناكەون گەلێك زۆرترن لەو كەسانەی كە بەقسەیان دەكەن و شوێنیان دەكەون.

وە هەروەها لە ڕیوایەتێكی تردا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((الذين يُصلحون إذا فسد الناس))[٢٧].

واتە: غەریبەكانی ئوممەتی من كەسانێكی چاكن و چاكسازیشن كاتێك خەڵكی خراپ دەبن (واتە: هەم خۆیان پەیوەستن بە دینەوە و چاكەكارن وەهەم بانگەوازی خەڵكیش دەكەن بۆ لای چاكە). بۆیە ئەهلی سوننەو جەماعە كەسانێكی غەریبن لەناو كۆمەڵانی ئەهلی بیدەع و شوێن كەوتوانی هەواو ئارەزوو كۆمەڵ و گروپە جیاوازو پارچە پارچەكاندا .

---

[٢٥] المسند الإمام أحمد، ٣٩٨/١، قال الشيخ الألباني: صحيح دون قال: قيل: وَمَن الغُرَباء؟ قالَ: النّزاعَ مِنَ القَبائِلِ، برواية: سنن ابن ماجه، ١٣٢٠/٢ برقم ٣٩٨٨.

[٢٦] المسند الإمام أحمد، ١٧٧/٢ و٢٢٢، وصححه العلاّمة الألباني في السلسلة الصحيحة، ١٥٣/٤، برقم ١٦١٩.

[٢٧] مسند الإمام أحمد، ١٧٣/٤ ، و صححه العلاّمة الألباني في السلسلة الصحيحة، ٢٦٧/٣ برقم ١٢٧٣.

٦ ـ ئەهلی سوننەو جەماعە کەسانێکن هەڵگری عیلم و زانستی شەرعین: ئەهلی سوننە هەڵگری ئەو عیلم و زانیارییە بەسودەی قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەرن (ﷺ)، کەسانێکن لادانی کەسانی ڕۆچوو لەم دینە دوور دەخەنەوە، وە لێکدانەوەی کەسانی نەفامی لێ دوور دەخەنەوە، هەر بۆیە إبن سیرین (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: ( کاتی خۆی زانایانی ئەهلی سوننە کەسێك فەرمودەی پێغەمبەری (ﷺ) بگێڕایەتەوە پرسیاری (سَنَد)یان نەدەکرد، بەڵام کاتێك فیتنە ڕوویدا (درۆ بەدەم پێغەمبەری خواوە (ﷺ) هەڵبەسترا، کۆمەڵ و تاقمی سەرلێشێواو پەیدا بوون، بیرو بۆچونی جیاواز لە بیرو بۆچونی پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵانی دەرکەوت) هەرکەسێك فەرمودەی بگێڕایەتەوە، پێیان دەووت: ناوی یەك بەیەك لەو پیاوانەی ئەم فەرمودەیەیان گێڕاوەتەوە بڵێن: ئەو کاتە سەیریان دەکرد ئەوانەی فەرمودەکەیان گێڕاوەتەوە ئەگەر لە ئەهلی سوننە بونایە فەرمودەکەیان وەردەگیرا، وەسەیر دەکرا ئەگەر ئەو کەسانەی کە فەرمودەکەیان گێڕاوەتەوە لە ئەهلی بیدەع بوونایە فەرمودەکەیان لێ وەرنەدەگیرا)[٢٨].

٧ ـ ئەهلی سوننەو جەماعە کەسانێکن خەڵکی دڵگران دەبن بە مردنیان: زانای پایە بەرز أيوبي السّختياني (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: (کاتێك هەواڵی مردنی پیاوێکی ئەهلی سوننەو جەماعەم پێ دەگات وا دەزانم هەندێ لە ئەندامەکانی لاشەم لەدەست داوە)[٢٩].

وە هەروەها فەرمویەتی: (ئەو کەسانەی حەز بە مردنی پیاوانی ئەهلی سوننەو جەماعە دەکەن کەسانێکن دەیانەوێت ڕووناکی خوای پەروەردگار بکوژێننەوە، بەڵام خوای پەروەردگار ڕووناکی خۆی هەر سەردەکەوێنێت ئەگەر

---

[٢٨] بڕوانە: صحيح مسلم، في المقدمة، باب الإسناد من الدين، ١ / ١٥.

[٢٩] بڕوانە: شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة، للالكائي، ١/٦٦، برقم ٢٩

بێباوەڕانیش پێیان نـــاخۆش بێت)[٣].

**◎باسـی سێ یەم: سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) نیعمەتێكی گشتی و ڕەهایە**

**دوو جۆر نیعمەت هەیە: نیعمەتێكی گشتی و ڕەها، نیعمەتێكی سنوردار:**

**یەكـەم:** نیعمەتی گشتی و ڕەها: ئەو نیعمەتەیە كە خۆشبەختی و سەرفرازی هەمیشەیی پێوە پەیوەستە: ئەویش نیعمەتی ئیسلام و سوننەتە، خۆشبەختی و سـەرفرازی هەمیشەیی دونیـاو دواڕۆژ لەسـەر سـێ بنـچینە وەسـتاوە: ئیـسلام، سوننـەت، دوور بـوون لە بەڵاو ناڕەحەتی لە دونیـاو دواڕۆژدا. نیعمـەتی ئیسلام و سوننـەت ئەو بەخشش و نیعمەتە گەورەیەیە كە خوای پـەروەردگار فـەرمانی پـێ كردووین لـە نوێژەكانماندا داوای لـێ بكـەین تـا هیداتـەتمان بـدات و ڕێنمونیمـان بكات بۆ سەر ڕێگای ڕاستی ئەو كەسانەی كە لە سەرین و خوای پەروەردگار ئـەو ڕێگا ڕاسـتەی پەیوەست كـردووە پێیانـەوە و گێڕاویـانێتی لـە هـاوەڵانی بـەرزی بەهەشت، هەروەك دەفـەرموێت: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا ٦٩﴾ (النساء)

واتە : ئەوانـەی گوێڕایـەڵی خـوای پـەروەردگار و پێغەمبـەر (ﷺ) دەكـەن ئەوانە كەسانێكن لە گەڵ ئەو كەسانەدان كـە خـوای پـەروەردگار نیعمـەتی خـۆی بەسەردا ڕشتوون لـە پێغەمبـەران (علیهم الصّلاة والسّلام) و ڕاسـتگۆیان و شـەهیدان و پیاو چاكان، بەڕاستی هاوەڵایەتی كردنی ئەوان باشرین هاوەڵایەتییە .

موسوڵمانی خۆشەویست ئەو جۆرە كەسانە خاوەنی ئەو نیعمەتە گـشتییەن ، ئەو كەسانەی كە خوای پـەروەردگار دەربارەیـان دەفـەرموێت: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ٣﴾ (المائدة: ٣)

واتە: ئەمڕۆ[٣١] دینم بۆ تەواوكردن و نیعمەتی خۆم ڕژاندووە بەسەرتانـــــدا

---

[٣] بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ١/٦٨، برقم ٣٥ .

وەڕازیم لێتان (ئەی موسوڵمانان) کە ئیسلام ئاینتان بێت و هیچ مەنهەج و ڕێباز و ئاینێکی تر نەکەنە ئاینی خۆتان.

زانای پایە بەرز إبن كثير (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرمویەتی: ﴿ئەم نیعمەت و بەخششەی خوای پەروەردگار گەورەترین نیعمەت و بەخششە بەسەر ئەم ئوممەتەوە لە کاتێکدا ئاینەکەی بۆ تەواو کردوون، پێویستیان بە هیچ ئاینێك نییە جگە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام، وە پێویستیان بە هیچ پێغەمبەرێك (ﷺ) نییە جگە لە پێغەمبەری خۆیان (ﷺ)، بۆیە خوای پەروەردگار پێغەمبەری (ﷺ) گێڕاوە بە دواین پێغەمبەر (ﷺ)، وە ڕەوانەی کردووە بۆ هەموو مرۆڤ و جنۆکەکان، هیچ حەڵاڵێك نییە مەگەر ئەو حەڵاڵی کردبێت، وە هیچ حەرامێك نییە مەگەر ئەو حەرامی کردبێت، وە هیچ مەنهەج و ڕێباز و ئاینێك حەق و ڕاست نییە مەگەر ئەو ئاینەی کە پێغەمبەر (ﷺ) بە دینی زانی بێت، وە هەر شتێك ئەو هەواڵی پێدابێت حەق و ڕاستە هیچ ناڕاستی و دواکەوتنی تێدا نییە﴾[32].

﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ هەم دین لەهەموو ڕوویەکەوە تەواوە و پێویستی بە زیادو کەم نییە، وە هەم خوای پەروەردگار تەواو نیعمەتی خۆی ڕشتووە بەسەر موسوڵماناندا .

ئیمامی عمري کوڕی عبدالعزیز (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت:

(ئیمان چەند سنور و فەرز و سوننەتێکی هەیە هەرکەسێك بە تەواوەتی جێبەجێیان بکات ئەوە ئیمانی تەواوە)[33].

---

[31] ڕۆژی حەجی گەورە بوو لە کێوی عەرەفە لە کاتی حەجیماڵئاوایی پێغەمبەری خوای پەروەردگار ﷺ پاش ئەوە بە ٨١ ڕۆژ پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد .

[32] بڕوانە : تفسير القرآن العظيم للإمام ابن كثير رحمه الله : (٣ / ٢٦٠) .

[33] رواه البخاري معلقاً، في كتاب الإيمان، باب قول النبي ﷺ : "بني الإسلام على خمس"، ١ / ٩.

وە دینی خوای پەروەردگار ئەو شەرعەیە کە فەرمان و ڕێگرییەکانی لە خۆ گرتووە، مەبەست پێی ئەو نیعمەتە گشتییەیە کە تایبەتە بە ئیمانداران، ئەویش نیعمەتی ئیسلام و سوننەتەکانی پێغەمبەرە (ﷺ)، ئەو نیعمەتەیە کە لە ڕاستیدا تەنها دڵ بەو خۆش دەکرێت، ئەو دڵ خۆشییەی کە خوای پەروەردگار خۆشی دەوێت و ڕازییە پێی، هەروەك خوای پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿ قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ هُوَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ۝٥٨ ﴾(يونس: ٥٨)

واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بە موسوڵمانان بڵێ: بادڵ خۆش و شادمان بن بە فەزڵ و بەخشش و ڕەحمەتی خوایی (کە ئیسلام و قورئانی پیرۆز و سوننەتە) کە وابوو با تەنها بەوە دڵخۆش بن، دڵخۆشیان بەوە زۆر چاکترو باشترە لە هەموو ئەو سەروەت و سامانەی کە خەڵکی کۆی دەکەنەوە.

بۆیە ووتەی زۆربەی زانایانی پێشین لەسەر ئەوەیە کە مەبەست بە ﴿بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ﴾ قورئانی پیرۆز و سوننەتەکانی پێغەمبەرە (ﷺ)، وە بە پێی ژیان و ڕوناکی ناو دڵەکان ئەوەندە خۆشەویستی بۆ سوننەتەکان دەبێت، بۆیە هەر کاتێك ئەو بەندە موسوڵمانە زیاد سوننەتەکان جێ بەجێ بکات و پەیوەست بێت پێیانەوە زیاتر دڵی خۆش دەبێت پێیان تا ئەو دڵە وای لێدێت دەکەوێتە جۆش و جوڵە لەبەر ئەو هەموو سوننەتەی کە تێیدایە، ئەو دڵە زۆر خەفەت بارە بەرامبەر بەو هەموو خراپەیەی کە خەڵکی دەیکەن لە کاتێکدا پڕە لە هێمنی و ئارامی، وە ئەو دڵەی کە بە ڕوناکی سوننەت پڕ بووە لە هەموو دڵێك ترساوترە لە خوای پەروەردگار[٢٤].

---

[٢٤] وەرگیراوە لە ووتەی زانای پایە بەرز إبن القيّم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە کیتابی: إجتماع الجيوش الإسلامية على غزو المعطلة والجهمية ٢/٣٣ — ٣٦، و٣٨.

**نیعمــەتی ســنوردارو دیــاری کــراو:** بریتیــە لــە نیعمەتــەکانی لــەش ســاغی و دەوڵەمەندی و جوانی و بوونی پلەو پایەو دەسەڵات و منداڵی زۆرو خێزانی جوان و...هاوشێوەکانی، ئــەم نیعمەتانــە هــەمو بەنــدەکانی خــوای پــەروەردگار تێیــدا بەشدارن: ئیمانداران و بێباوەڕان، چاکەکاران و خراپــەکاران، بۆیــە هــەرکاتێك ووتــرا: خــوای پــەروەردگار نیعمــەتی بەســەر بێباوەڕانــەوە هەیــە، بــەڵێ لــەم ڕووەوەیــە، وە ئــەم جــۆرە نیعمەتانــە بــۆ بــێ بــاوەڕان و خراپــەکاران ســزاو ناڕەحەتییــە، چــونکە ســەرئەنجامی ســزاو بەدبــەختی یــە بــۆ کەسێك کــە خــوای پەروەردگار نیعمەتە گشتیەکەی پێ نەبەخشێبێت کە (ئیسلام و قورئانی پیرۆز و سوننەتەکانی پێغەمبەرە ﷺ)[٣٥].

## ۞باسی چوارەم: گەورەیی و پلەو پایەی سوننەت

سوننەت ئەو قەڵا پۆڵاینەیە کە هەر کەسێك بچێتە نــاوی کەسێکی ئــەمین و هێمن و پارێزراوە، وە ئەو دەرگا گەورەیەیە کە هەر کەسێك بچێتە نــاوی دەگــات بەمەست و ئاواتەکانی، سوننەت ئەو کەسانەی کــە پەیوەستن پێیــەوە بــەرزیان دەکاتەوە ئەگەر کردەوە چاکەکانیشیان کەم بێت، وە ڕوناکییەکەی لە ناو چاوو بەردەستیان دایە لە کاتێکدا کەسانی بیدعەچی نورو ڕوناکیەکــەیان کوژاوەتــەوە، ئەهلی سوننە ڕووگەش و دەم و چاو سپین لە کاتێکدا ئەهلی بیدەع ڕوو ڕەشــن و دەم و چاویان ڕەش هەڵگەڕاوە، هەروەك خوای پەروەردگار فەرمویــەتی: ﴿ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ﴿١٠٦﴾ ﴾ (آل عمران ١٠٦)

واتە: لەو ڕۆژەدا "کە ڕۆژی قیامەتە" کەسانێك دەم و چاویان ڕەش دەبێت و کەسانێك دەم و چاویان سپی و ڕوناك و درەوشاوە دەبێت.

---

[٣٥] بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ٢/٣٦

بن عباس (رضي الله عنهما) فەرموویەتی: دەم و چاوی کەسانی پەیوەست بە سوننەت و جەماعە سپی و ڕوناك و درەوشاوە دەبێت، دەم و چاوی کەسانی بیدعەچی و پارچەپارچەگەریەکان ڕەش هەڵدەگەڕێت[٣٦].

سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ژیان و ڕوناکییەیە کە سەرفرازی و بەختەوەری و هیدایەتی بەندەی موسوڵمانی تێدایە. هەروەها خوای پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا كَذَلِكَ زُيِّنَ لِلْكَافِرِينَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٢٢﴾﴾ (الأنعام: ١٢٢)

واتە: ئایا ئەو کەسەی کە مردبوو (لە گومرایی و سەرلێشێواویدا ئەژیا) ئێمە زیندومان کردەوە بە ڕوناکی ئیمان وقورئان، ئەو کەسە ئەزانێت چۆن ڕێگەی ڕاست ئەگرێتە بەرو هەڵسوکەوت ئەکات لە ناو خەڵکیدا، ئایا وەکو ئەو کەسە وایە کە لە تاریکاییەکانی شیرك و بێ باوەڕی و نەزانی و سەرلێشێواویدا ئەژێت و ناتوانێت دەر بچێت و ڕزگاری ببێت، بەو شێوەیە هاوەڵ بڕیاردان و بێ باوەڕی و خراپەکاری بۆ بێ باوەڕان ڕازێنراوەتەوە[٣٧].

[٣٦] زانای پایە بەرز (ڕەحمەتی خوای لێبێت) إبن القیم، لە کیتابی: إجتماع الجیوش ٣٩/٢، وە زانای پایە بەرز إبن کثیر (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە تەفسیرەکەیدا، باسیان کردووە ٣٦٩/١، وە بڕوانە: جامع البیان عن تأویل آي القرآن، لإبن جریر، ٩٣/٧.

[٣٧] بڕوانە: اجتماع الجیوش الإسلامیة لابن القیم، ٣٨/٢.

## ◎باسی پێنجەم: شوێن و پلەو پایەی بەرزی کەسانی پەیوەست بە سوننەت، وە شوێنی کەسانی بیدعەچی

### یەکەم: شوێن و پلەو پایەی بەرزی کەسانی پەیوەست سوننەت:

موسوڵمانی پەیوەست بە سوننەت دڵی زیندووە، دڵی ڕۆشنە، خوای پەروەردگار لە چەند شوێن لە قورئانی پیرۆزدا باسی ژیان و ڕوناکی کردووە و گێڕاویانێتی بە سیفاتی ئیمانداران، بۆیە دڵێکی زیندوو و ڕۆشن ئەو دڵەیە: ژیرمەندە بەرامبەر خوای پەروەردگار، مل کەچە بۆی، وە تێگەیشتووە لە مەبەستی خوای پەروەردگار، مل کەچە بۆ ئەوەی تەنها خوا ناس بێت و تەنها عیبادەت بۆ ئەو بکات، وە مل کەچ و شوێن کەوتووی ئەو مەنهەج و ڕێباز ەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) پێی هاتووە.

بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) داوای لە خوای پەروەردگار دەکرد تا نورو ڕوناکی پێ ببەخشێت: داوای دەکرد تا دڵ و گوێ و چاوو زمان و سەرووی و ژێری و لای ڕاستی و لای چەپی و پشت و پێشی ڕوناک بکاتەوە، داوای دەکرد زاتەکەی و پێستی و خوێن و گۆشت و ئێسکی ڕوناک بکات بە ڕوناکی ئیمان، پێغەمبەر (ﷺ) داوای ڕوناکی ئیمانی کردووە بۆ خودی خۆی و بۆ هەستیارە نهێنی و ئاشکراکانی، بۆ ڕاست و چەپ و سەروو ژێر و پێش و دوای، داوای ئەو ڕوناکییەی کردووە، بۆیە ئیمانداریش هەستان و دانیشتن و قسەو کردەوەی هەمووی ڕوناکییە، ئەو نورو ڕوناکییە کە لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ خاوەنەکەی دەردەکەوێت بە پێی بەهێزی و لاوازی ئیمانەکەی، ئەو ڕوناکییەی لەبەر دەم و لای ڕاستیەوە دەدرەوشێتەوە، بۆیە لە ڕۆژی قیامەتدا موسوڵمانی واهەیە نورو ڕوناکییەکەی وەکو خۆر وایە لە ڕوناکیدا، وە موسوڵمانی واهەیە نورو ڕوناکییەکەی وەکو مانگ درەوشاوەیە، وە هەیانە وەکو دار خورمایەکی بەرز، هەیانە وەکو پیاوێکی بە پێوە وەستاو، هەیە لەوان کەمتر، موسوڵمانی واهەیە نورو ڕوناکی پێدراوە کە بەسەرە پەنجەی قاچێوەیەتی، جارێك دەدرەوشێتەوەو جارێك دەکوژێتەوە، وەکو ئەو ڕوناکی و ئیمانە و شوێن کەوتنەی کە هەیبووە لە

دونیادا بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەوەش هەستی پێ دەکرێت و بەچاویش دەبینرێت کە موسوڵمانان هەموویان لەیەك ئاستدا نین لە شوێن کەوتنیان بۆ قورئانی پیرۆز و سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ)[٣٨].

**۞دووەم: نیشانەکانی ئەهلی سوننەو جەماعە زۆرن، هەموو کەسێکی ژیر هەستی پێدەکات، لە گرنگترین نیشانەکانیان ئەمانەن:**

١ ـ دەست گرتنیان بە قورئانی پیرۆز و سوننەتەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ).

٢ ـ گێڕانەوەی حوکم بۆ لای قورئانی پیرۆز و سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە هەموو بنچینەو بەشەکانی شەرعدا .

٣ ـ خۆشەویستیان بۆ ئەهلی سوننەو جەماعە و کەسانی پەیوەست بە قورئانی پیرۆز و سوننەتەوە، وە ڕق بوونیان لە کەسانی بیدعەچی.

٤ ـ ئەهلی سوننەو جەماعە کەسانێکن دانا چەلەکێن و بێ تاقەت نابن لەوەی کە خەڵکی (بگرە موسڵمانانیش) کەم شوێنی حەق دەکەون، چونکە حەق بزر بووی ئیماندارە لە هەر شوێنێك بینیتیەوە دەستی پێوە دەگرێت ئەگەر چی خەڵکیش پێچەوانەیان بکەن.

٥ ـ ئەهلی سوننەو جەماعە کەسانێکی ڕاستگۆن لە ووتەو کردەوەکانیاندا، ئەویش بەجێبەجێ کردنی مەنهەج و ڕێبازی ڕاست و دروستی قورئانی پیرۆز و سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ).

٦ ـ ئەهلی سوننەو جەماعە لە هەموو موسوڵمانان زیاتر شوێنی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەون، ئەو پێغەمبەرەی (ﷺ) کە هەموو هەڵس و کەوتی بریتی بووە لە جێبەجێ کردنی قورئانی پیرۆز[٣٩].

---

[٣٨] بڕوانە: إجتماع الجيوش الإسلامية لإبن القيم،٢/٣٨ – ٤١، بە دەستکارییەوە لە لایەن دانەرەوە.

[٣٩] بڕوانە: عقيدة السّلف وأصحاب الحديث، للإمام أبي عثمان الصابوني ص ١٤٧، وتنبيه أولي الأبصار إلى كمال الدين وما في البدع من الأخطار، للدكتور صالح بن سعد السحيمي ص ٢٦٤

## ۞ کەسی بیدعـەچـی چـۆنـە ؟

کەسی بیدعەچـی دڵـی مـردووە و تـاریکی داپۆشـیوە، خـوای پـەروەردگار مـردن و تـاریکی گێـڕاوە لـە سـیفاتی ئـەو کەسـانەی کـە لـە ئیمـان و بـاوەڕی ڕاسـتەقینە لایـان داوەو دەرچـونە، دڵـی مـردوو ئـەو دڵەیـە کـە نـە لـە خـوای پەروەردگار تێگەیشتووە و نە مل کەچێکی تەواوە بۆ ئەو مەنهەج و ڕێبـازەی کـە پێغەمبەر (ﷺ) پێی هاتووە، هەربۆیە خوای پەروەردگار ئـەو جۆرە کەسـانەی وەسـف کـردووە بـەوەی کـە مـردوون نـەك زینـدوو، وە بـەوەی لـە تـاریکی و سەرلێشێواویدان ناتوانن تێیدا دەربچن، لەبەر ئەوەی تاریکی سـەراپای گیانیـانی داپۆشـیوە، دڵـەکانیان مـردووە هـەر بۆیـە حـەق و ڕاسـتی لـە شـێوەی خراپـەدا دەبینن و شتی باتڵ و ناڕاستی لـە شـێوەی حـەق و ڕاسـتیدا دەبیـنن، کردەوەو قسەو کارو ژیانیـان هـەمووی تـاریکی و سـەر لێشێواویە، گۆڕەکانیـان پـڕە لـە تاریکی، وە لە ڕۆژی قیامەتدا کاتێك نورو ڕوناکی بەش دەکرێت تا بتوانن لەسـەر پردی دۆزەخ پێی بپەڕنەوە ئەوە ئەوان بێبەش دەبن و لـە تاریکیـدا دەمێننـەوە، چونە ناو ئاگری دۆزەخیان بە تاریکییە، ئەو تاریکییـەی کـە لەسـەرەتادا مرۆڤـی لەسەر دروست کراوە.

جا خوای پـەروەردگار سـەرفرازی و بەختـەوەری ڕزگـاربوونی هەرکەسـێکی بوێت لەو تاریکییـەوە دەری دەکـات بـەرەو ڕونـاکی (ڕوونـاکی ئیمـان و قورئـانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)، وە هەر کەسـێك خـوای پـەروەردگار بیـەوێت سەرفرازی نەکات لەو تاریکیانەدا دەیهێڵێتەوە و دەری ناکات (ئـەویش بـە هـۆی گوێ نەدانی بە مەنهەج و ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ)[40].

---

[40] بڕوانە: إجتماع الجيوش الإسلامية، لإبن القيم، ٢/٣٩ - ٤٠ بە دەستکارییەوە لە لایەن دانەرەوە.

## ❁ بەشی دووەم: تاریكییەكانی بیدعەو تازە داهێنراوەكان لە دیندا :

### باسی یەكەم: تێگەیشتن لە مانای بیدعه

وشەی(البِدعَة) لە زمانەوانیدا: داهێنانی شتێكی تازە لە دیندا پاش تەواو بوونی، یان داهێنانی شتێكی تازە لە هەواو ئارەزوو و كردەوەكان پاش مردنی پێغەمبەر (ﷺ)[٤١] ، دەوترێت: (إبتدعتُ الشيءَ، قولاً أو فعلاً إذا ابتدأته على غير مثال سابق)[٤٢] شتێكی تازەم داهێنا (قسه بێت یان كردەوە) كەلەوەو پێش هاو شێوەی نەبوبێت .

وە بنچینەی ووشەی "بَدَعَ" بۆ كردن و داهێنانی كارێك بەكاردێت كە لەوەو پێش بوونی نەبوبێت، بەڵگە لەسەر بەكارهێنانی ووشەی بیدعە بەو شێوەیە فەرمودەی خوای پەروەردگارە كە دەفەرموێت:

﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ ﴿١١٧﴾ ﴾(البقرة:١١٧) .

واتە: خوای پەروەردگار دروست كەرو بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەوییە لەسەر شێوەیەك كە لەوەو پێش بوونیان نەبووە.

وشەی "البدعة" لە ڕوانگەی شەرعەوە چەند پێناسەیەكی بۆ كراوە كە هەندێكیان تەواكەری هەندێكیانن، لەوانە:

١ ـ زانای پایەبەرزو شێخی ئیسلام إبن تیمیة (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: (بیدعە لە دیندا بریتیە لە: كردنی ئەو كارانەی كە خوای پەروەردگار و پێغەمبەر (ﷺ) بەشەرعیان دانەناوە، واتە: كردنی ئەو كارانەی كە نە فەرمانی پێكراوە تا ببێتە واجب یان فەرمانی پێكرابێت تا ببێتە سوننەت)[٤٣].

---

[٤١] بڕوانە: القاموس المحيط ص ٩٠٦، ولسان العرب ٨/٦، وفتاوى ابن تيمية ٣٥/٤١٤.

[٤٢] بڕوانە: معجم المقاييس في اللغة لابن فارس ص ١١٩.

[٤٣] بڕوانە: فتاوى إبن تيمية ٤/١٠٧ – ١٠٨.

**بيدعه دوو جۆره:** جۆرێكيان له ووتەو بیروباوەڕەكاندایه، وه جۆرێكیان له كردەوەو پەرستنەكاندایه، ئەم جۆرەی دووەمیان جۆری یەكەمی له خۆی گرتووه، هەروەك چۆن جۆری یەكەم دووەم ڕادەكێشێت[٤٤].

وه ئەوەی كه ئیمامی أحمد و جگه لەویش مەنهەج و ڕێبازی خۆیان له سەر بنیات ناوه ئەوەیه: كردەوەكان دووبەشن: عیبادەت و پەرستنەكان، داب و نەریتەكان(عادات): بۆیه بنەڕەت و بنچینه لەعیبادەت و پەرستنەكاندا ئەوەیه: هیچ عیبادەت و پەرستنێك دروست نییه بكرێت تەنها ئەوەی كه خوای پەروەردگار بەشەرعی داناوه، وه بنەڕەت و بنچینه له داب و نەریتەكاندا (عادات) ئەوەیه: كه هیچ داب و نەریتێك حەرام نییه مەگەر ئەوانەی كه خوای پەروەردگار حەرامیانی كردبێت[٤٥].

وه هەروەها فەرمویەتی: (بیدعه: ئەو بیروباوەڕو كردەوانەیه كه پێچەوانەی قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەرو (ﷺ) كۆڕای زانایان بكات، وەكو ووتەو بۆچونەكانی كۆمەڵانی خەواریج و شیعەو قەدەرییه و جەهەمیەكان، یان وەكو كردەوەی ئەو كەسانەی كه سەمادەكەن و گۆرانی دەڵێن له مزگەوتەكاندا به مەبەستی عیبادەت و خوا پەرستی (دەعوەو بانگەوازكردن)، یان ئەو كەسانەی ڕیشیان دەتاشن به مەبەستی عیبادەت و خواپەرستی، یان خواردنی حەشیشه، وه جۆرەهای تری بیدعه كه كۆمەڵانێك له موسوڵمانانی پێچەوانەو دژ به قورئان و سوننەت پەرستن و عیبادەتی پێوه دەكەن بۆ خوای پەروەردگار)[٤٦].

٢ ـ زاناو ئیمامی پایەبەرز ئیمامی الشاطبي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: (البدعة: طَرِيقَةٌ فِي الدِّينِ مُخترَعَة، تُضاهِي الشَّرعِيَّة، يُقصَدُ بِالسُّلوكِ عَلَيها المُبالَغَةُ فِي

[٤٤] بڕوانه: هەمان سەرچاوه، ٢٢/٣٠٦.

[٤٥] بڕوانه: هەمان سەرچاوه، ٤/١٩٦.

[٤٦] بڕوانه: فتاوى إبن تيمية ١٨/٣٤٦، و ٣٥/٤١٤.

التَّعبُّد لله سُبحانَه)[٤٧].

واتە: بیدعە: ئەو ڕێگا تازە داهێنراوەیە كە ئەگەر ببینیت و سەیری بكەیت لە كارێكی دروست و شەرعی دەچێت (كەلە بنەڕەتیشدا وانییە) مەبەست بەكردن و ئەنجامدانی ئەو كارە زیاد عیبادەت كردنە بۆ خوای پەروەردگار.

بۆیە لەسەر ئەم بۆچونە هەندێك لە زاناكان كارە داب و نەریتەكان (عادات) ناكەنە ژێر واتای بیدعەوە، بەڵكو دەڵێن: بیدعە تەنها تایبەتە ئەو كارانەی كە پەرستن و عیبادەتن، وە لە سەر بۆچونی ئەو زانایانەی كە كارە داب و نەریتەكان (عادات) ئەخەنە ژێر واتای بیدعەوە، دەفەرمون: (بیدعە: ئەو ڕێگا تازە داهێنراوەیە كە ئەگەر ببینیت و سەیری بكەیت لە كارێكی دروست و شەرعی دەچێت (كەلە بنەڕەتیشدا وانییە) مەبەست بە كردن و ئەنجامدانی ئەو كارە هەروەك مەبەست بوون بە ئەنجامدانی كارە خێرو شەرعیەكانە)[٤٨].

پاشان ئیمامی الشاطي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ئەوەمان بۆ ڕوون دەكاتەوە لەسەر پێناسەی دووەم بۆ بیدعە كە كارە داب و نەریتەكان (عادات) لەو ڕووەوەی كە تەنها كارێكی داب و نەریتن (عادات) ئەوە هیچ بیدعەیان تێدا نییە، بەڵام ئەگەر ئەو كارە لەو ڕووەوە سەیری بكرێت كە عیبادەتی پێوە بكرێت، یان ئەو كاتە بیدعەی تێكەڵ دەبێت، بەمە بۆمان دەردەكەوێت كە ئیمامی الشاطي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) هەردوو پێناسەكەی كۆكردۆتەوە، وە نمونەی هێناوەتەوە بۆ چەند كارێكی داب و نەریت، كە بێ گومان دەبێ عیبادەتی تێدا بێت وەكو: كڕین و فرۆشتن و ژن مارەكردن و تەڵاق دان و....، لەبەر ئەوەی ئەم كارانە هەر چەندە لەبەشی موعامەلات و داب و نەریتەكانن بەڵام پەیوەست و سنوردار كراون بە چەند مەرجێك و ڕێكخەرێكی شەرعی كە هیچ كەس ناتوانێت دەس كاری بكات

---

[٤٧] بڕوانە: الإعتصام لشاطبي ١/٥٣.

[٤٨] بڕوانە: الإعتصام لأبي إسحاق إبراهيم بن موسى الشاطبي ١/٥٠ – ٥٦.

و بە هەوەسی خۆی مامەڵەیان پێوە بکات[٤٩].

٣ ـ زاناو ئیمامی پایەبەرز ابن رجب (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: (مەبەست بە بیدعە ئەوەیە: کارێکی تازە دابهێنرێت لە دیندا لە کاتێکدا هیچ بنچینەیەکی شەرعی نەبێت لەسەر دروستێتی ئەو کارە، بەڵام ئەو کارەی کە بنچینەیەکی شەرعی لە بنەڕەتدا هەیە لە سەر دروستێتی ئەوە بیدعە نیە لە شەرعدا، هەرچەندە ئەگەر پێی بوترێت بیدعە لە زمانەوانیدا، بۆیە هەرکەسێك شتێکی تازە دابهێنێت و بیداتە پاڵ شەرع و بنچینەیەکی شەرعی نەبێت تا ئەو کارەی بۆ بگەڕێنرێتەوە ئەوە کردنی ئەو کارە سەرلێشێواویە، وە ئاین بەرییە لەوکارە، جا داهێنانی ئەو کارە لە بیروباوەڕەکاندا بێت یان لە کردەوەو قسە نهێنی و ئاشکراکاندا بێت، بەڵام ئەوەی کە لە ووتەی زانایانی پێشیندا هاتووە گوایە کردنی هەندێ لە بیدعەکان بەباش زانراوە ئەوە مەبەست پێی ئەو بیدعەیەیە کە لە زمانەوانیدا پێی دەوترێت بیدعە نەك لە شەرعدا، هەروەك لە ووتەکەی ئیمامی عومەردا (ﷺ) هاتووە کاتێك بینی موسوڵمانان هەندێکیان بە جەماعەت تەراویح دەکەن و هەندێکیان بەتاك دەیکەن، ئەوەبوو کۆیانی کردەوە و یەك ئیمامی بۆیان دانا، تا پێش نوێژیان بۆ بکات، ئەوەبوو دوای ئەوە کە بینیتیانی بە جەماعەت نوێژ دەکەن فەرموی: ((نِعمَتِ البِدعَةُ هذه)) چاکترین بیدعە ئەم کارەیە، مەبەستی ئیمامی عومەر (ﷺ) ئەوەبوو ئەم کارە لەوەو پێش بوونی نەبوو بەو شێوەیە، بەڵام لە شەرعدا بنچینەیەکی شەرعی هەبوو تا ئەم کارەی بۆلا بگەڕێنرێتەوە:

* یەکێك لەو بنچینانە ئەوەیە پێغەمبەر (ﷺ) هانی موسوڵمانانی دەدا تا نوێژی تەراویح بە جەماعەت بکەن، جا موسوڵمانان لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ئەو شەو نوێژو تەراویحەیان دەکرد بەڵام بەتاك تاك و چەند

[٤٩] بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ٥٦٨/٢، ٥٦٩، ٥٧٠، ٥٩٤.

كۆمەڵێكی جیاواز، پێغەمبەر (ﷺ) چەند شەوێك نوێژی تەراویحی بۆ كردن بەجەماعەت، بەڵام پاش ئەوە بۆی نەكردن لە ترسی ئەوەی نەك فەرز بێت لەسەریان (واتە: كردنی بە جەماعەت ببێتە فەرز نەك خودی نوێژەكە) و ئەوانیش نەتوانن بەو شێوەیە بیكەن، بۆیە پاش مردنی پێغەمبەر (ﷺ) ئێمەی موسوڵمان ئەمینین و لەوە ناترسین كە ئەو نوێژە لە سەرمان ببێتە فەرز[٥٠].

* دووەم بنچینە لەو بنچینانەی كە ئەم كارەی بگێڕدرێتەوە سەرو كەسانی بیدعەچی نەتوانن ئەم ووتەیەی ئیمامی عومەر (ﷺ) بكەنە بەڵگە لەسەر دروستێتی تازە داهێنان و بیدعە كردن لەدیندا ئەوەیە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێ كردووین شوێنی مەنهەج و ڕێبازو سوننەتی جێنشینە بەڕێزەكانی بكەوین، بۆیە ئەم كارەش بووەتە سوننەتی خەلیفە بەڕێزەكانی)[٥١].

### ✿ بیدعە دوو جۆرە:

* بیدعەیەك كوفرەو هەر كەسێك بیكات لە دین پێی دەردەچێت.

* بیدعەیەك تاوان و سەرپێچیە ئەگەركەسێك بیكات لەدین پێی دەرناچێت[٥٢].

### ✿ باسی دووەم: مەرجەكانی گیرابوون و قەبوڵ بوونی كردەوە چاكەكان:

موسوڵمانی خۆشەویست هەركردەوەیەكی خێرو چاكە ئەگەر دەتەوێت لە خوای پەروەردگار نزیكت بكاتەوە، بزانە لێت وەرناگیرێت و قەبوڵ نابێت ئیللا دەبێت ئەو كردەوە چاكەیە دوو مەرجی تێدا بێت تا لای خوای پەروەردگار وەربگیرێت:

---

[٥٠] بڕوانە. صحيح البخاري، كتاب صلاة التراويح، باب فضل من قام رمضان، ٢/٣٠٩، برقم ٢٠١٢.

[٥١] بڕوانە: جامع العلوم والحكم ٢/١٢٩.

[٥٢] بڕوانە: الإعتصام للشاطبي ٢/٥١٦.

**مەرجی یەکەم:** دەبێت ئەو کردەوەیە تەنها بۆ خوای پەروەردگار بێت و هیچ ریاو بەشی هەواو ئارەزوو نەفسی تێدا نەبێت، لە بەر فەرمودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرموێت: ((إنّما الأعمال بالنّيات، وإنّما لكلّ أمريءٍ ما نوى))[53].

واتە: وەرگیرانی کردەوەکان بە پێی نیەتەکانن، وە هەر کەسێك کاتێك کردەوەیەکی چاکە دەکات وەرگیران و قەبوڵ بوونی بە پێی ئەو نیەتەیە کە هەیەتی.

**مەرجی دووەم:** شوێن کەوتنی پێغەمبەر (ﷺ) لە کردنی ئەو کارەدا، لە بەر فەرمودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرموێت: ((مَن عَمِلَ عَمَلاً لَيسَ عَلَيه أمرُنا فَهُوَ رَدٌّ))[54].

واتە: هەرکەسێك کارێك بکات و فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت بە کردنی، ئەوە بەسەریدا دەدرێتەوەو لێی وەرناگیرێت.

بۆیە هەر موسوڵمانێك کاتێك کردەوەیەکی چاکە دەکات ئەگەر تەنها بۆ خوای پەروەردگاری بێت و لەسەر فەرمان و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بێت ئەوە کردەوەکەی وەرگیراوە (إن شآء الله)، وە هەرکەسێك کاتێك کردەوەیەکی چاکە دەکات ئەگەر دڵسۆزی و إخلاصی تێدا نەبێت یان بەفەرمان و لەسەر سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) نەبێت، یان یەکێك لەو دوو مەرجەی تێدا نەبێت ئەوە دەکەوێتە بەر ئەو ئایەتەی خوای پەروەردگار کە دەفەرموێت: ﴿ وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُوا۟ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَـٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾ ﴾ (الفرقان: ٢٣)

واتە: کاتێك تەماشای ئەو کردەوانەمان کرد کە ئەنجامیان دابوو، بەرباماندا و کردمان بە تەپوو تۆزێکی پەرش و بڵاو (هیچ سوودی نییە بۆیان).

---

[53] متفق عليه: البخاري، كتاب بدء الوحي، باب كيف كان بدء الوحي إلى رسول الله ﷺ، ١/ ٩، برقم ١، ومسلم، كتاب الإمارة، باب قوله ﷺ: "إنما الأعمال بالنيات" ٣/ ١٥١٥، برقم ١٩٠٧

[54] مسلم، كتاب الأقضية، باب نقض الأحكام الباطلة، ورد محدثات الأمور، ٣/ ١٣٤٤، برقم ١٧١٨، وعند البخاري ومسلم "من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو رد" البخاري برقم ٢٦٩٧، ومسلم برقم ١٧١٨

وە هەركەسێك هەردوو مەرجەكەی گیرابوونی كردەوە چاكەكانی تێدا بێت ئەوە دەكەوێتە بەر ئەو ئایەتەی كە خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ ﴿١٢٥﴾ ﴾ (النساء ١٢٥) .

واتە: كێ هەیە لەو كەسە ئاینی جوانتر و ڕێكترو باشتر بێت كە ڕووی كردۆتە خوای پەروەردگار و تەواو خۆی داوەتە دەست ئەوو زۆر چاكەكاریشە، بێ گومان هیچ كەس لەو باشتر نییە.

وە هەروەها دەكەوێتە بەر فەرموودەی خوای پەروەردگار كە دەفەرموێت:

﴿ بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُۥٓ أَجْرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١١٢﴾ ﴾ (البقرة: ١١٢) .

واتە: نەخێر وانییە (پەرچدانەوەیە بۆ جولەكە و گاورەكان كە دەیان ووت: هەرگیز هیچ كەس ناچێتە بەهەشتەوە تەنها جولەكەو گاور نەبێت) بەڵكو هەركەسێك بە تەواوی و بە ڕاستی خۆی بداتە دەست خوای پەروەردگار و لە هەمان كاتدا موسوڵمان و چاكەكار بێت، ئەوە بە ڕاستی پاداشتی لای خوای پەروەردگار هەیە و نەترسیان هەیەو نەغەم و پەژارە دایان دەگرێت[٥٥].

وە ئەو فەرموودەیەی كە ئیمامی عومەر (ﷺ) گێڕاویێتیەوە: ((إنما الأعمال بالنِّيات)) ترازوو پێوەرێكە بۆ هەموو كردەوەكانی ناو دڵ (نهێنیەكان)، وە ئەو فەرمودەیەی كە دایكی ئیمانداران خاتوو عائیشة (رضي الله عنها) گێڕاویێتیەوە: ((مَن عَمِلَ عَمَلاً لَيسَ عَلَيهِ أمرُنا فَهُوَ رَدّ)) ترازوو پێوەرێكە بۆ هەموو كردەوەكانی لاشە (ئاشكراكان) ، ئەم دوو فەرموودە گەورەیە هەموو دینی لە ژێردا جێ دەبێتەوە: هەموو بنچینەو بەش و نهێنی و شاراوەكان و هەموو قسەو كردەوەكان.

---

[٥٥] بڕوانە: بهجة قلوب الأبرار وقرة عيون الأخيار، لسعدي، ص ١٠

وە ئیمامی النّـــووي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) بەڕاستی ووتەیەکی زۆر جوانی کردووە لەسەر فەرموودەکەی دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشة (رضي الله عنها)، کە گێڕاوێتیەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمویەتی: ((مَن أحدَثَ في أمرِنا هـذا مَـا لَيسَ مِنهُ فَهُوَ رَدّ)) وە لە گێڕانەوەیەکی تردا کە فەرمویەتی: ((مَن عَمِلَ عَمَلاً لَيسَ عَلَيه أمرُنا فَهُو رَدٌّ))، شارەزایانی زمانی عەرەبی فەرموویانە: ووشەی (الـرَّدُّ هنـا بمعنى المَـردُود) واتـە: کردەوەکـەی بەسـەردا دەگێڕدرێتـەوەو لێی وەرناگیرێ و کردەوەکەی (دڵسۆزی تێدا نەبووە بۆ خوا یان بەبێ فـەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) کردویەتی) لـە شـەرعدا هـیچ گرنگـی بـۆ دانانرێـت، بۆیـە ئـەم فـەرمودە پیرۆزە بنەمایەکی زۆر گەورەیە لە بنەماکانی ئیسلام، وە یەکێکە لەو فەرمودانـەی کـە گـشتگیری قـسەکانی پێغەمبـەر (ﷺ) دەردەخـات، فەرمودەیـەکی ڕوون و ئاشـکرایە لەسـەر ڕەت کردنـەوەو نادروسـتێتی هـەموو بیدعـەو تـازە داهێنراوێـك لەدیندا، وە لـە ڕیوایەتەکەی دووەمـدا کـە زیـاتری تێدایـە ئـەویش ئەوەیـە هـەر کردەوەیەك دەکەیت ئەگەر بیدعە بێت شەرعی نییەو نادروستە، جا خۆت یەکەم کەس بیت ئەو بیدعەیەت داهێنا بێت یـان هـەر کەسێکی تـر بێـت، بۆیـە جـاری وادەیە کەسێك کاتێـك بیدعەیـەك دەکـات فەرمودەکـەی یەکـەم دەکرێتـە بەڵگـە بەسەریەوە لە سەر نادروستێتی بیدعە ((مَن أحدَثَ في أمرِنا هذا مَا لَيسَ مِنهُ فَهُـوَ رَدّ)) کەسی بیدعە چییەکە دەڵێت: خۆ من یەکەم کـەس نـیم ئـەم کـارەم داهێنـا بێت، لەو کاتەدا فەرمودەکـەی دووەم: ((مَن عَمِلَ عَمَلاً لَيسَ عَلَيه أمرُنا فَهُـو رَدٌّ)) دەکرێتە بەڵگە بەسـەریەوە لـە سـەر نادروسـتێتی بیدعـە، بـەڵکو فەرمودەیـەکی ڕوون و ئاشکرایە بۆ ڕەت کردنەوەو ناشەرعێتی هەموو کـارە تـازە داهێنراوەکـان جا ئەو کەسە خۆی یەکەم کەس بێت ئەو کارەی داهێنابێت یان پێشتر کەسـانێك کردبێتیان ئەویش بیکات و بەردەوام بێت لەسەری[٥٦].

---

[٥٦] بڕوانـە: شرح النووي على صحيح مسلم، ٢٥٧/١٤، وە بڕوانـە: المفهم لما أشكل من تلخيص كتـاب

## ✪ باسی سێیەم: سەرزەنشت كردن و خراپەی بیدعە لە دیندا

**یەكەم: سەرزەنشت كردن و خراپەی بیدعە لە دیندا**

چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) هاتوون سەبارەت بە سەرزەنشت كردن و خراپەی بیدعە لە دیندا، وە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) و شوێن كەوتوانیان بە چاكی ئێمەیان ئاگادار كردۆتەوە لە خراپەو ترسناكی بیدعە، لەو فەرموودانەی كە هاتوون بە شێوەیەكی كورت و پوخت:

١ ـ خوای پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۗ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ ﴿٧﴾ ﴾ (آل عمران: ٧) .

واتە: خوای پەروەردگار ئەو خوایەیە كە قورئانی پیرۆزی دابەزاندووە بۆسەر تۆ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) هەندێك لە ئایەتەكانی ئەو قورئانە دامەزراوو ڕوون و ئاشكران و بناغەو بنچینەی قورئانەكەن، وە هەندێك لە ئایەتەكانی ماناو واتای جۆراو جۆر هەڵدەگرن و بە ئاسانی ماناكەی نازانرێت، جا ئەو كەسانەی كە لە دڵیاندا لاری و لادان هەیە، حەز لە حەق و ڕاستی ناكەن و بەڵكو شوێنی ئەو ئایەتانە دەكەون كە ماناو واتای جۆراو جۆرو فراوانیان هەیە بۆ ئەوەی فیتنەو ناكۆكی و دوو بەرەكی دروست بكەن یان بۆ ئەوەی لێكدانەوەی هەڵەو نادروستی بۆ هەڵبەستن، لە كاتێكدا لێكدانەوەو زانینی ماناو واتاكەی كەس نایزانێت تەنها خوای پەروەردگار نەبێت.

ئیمامی (الشاطبي) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) چەندین ووتەی زانایانی پێشوی هێناوە كە بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەم ئایەتە ئەو كەسانە دەگرێتەوە كە دەمە

---

مسلم، للقرطبي ٦/١٧١.

دەمێ و موناقەشە دەکەن لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و کۆمەڵی خەواریج و شوێنکەوتوان هاو شێوەکانیان دەگرێتەوە[٥٧].

٢ ـ ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾﴾ (الأنعام: ١٥٣) .

واتە: ئەوەی کە باسکرا ﴿لە دوو ئایەتی پێشودا ، ١٥١-١٥٢ کە خوای پەروەردگار فەرمانی دەکات بە ئەنجامدانی چەند چاکەیەك و دوورکەوتنەوە لە چەند خراپەیەك﴾ مەنهەج و ڕێبازی حەق و ڕاستی منە، شوێنی بکەون و ئەو ڕێگا ڕاستە بکەنە مەنهەج و ڕێبازی خۆتان و لێی لامەدەن و شوێنی ڕێچکە ڕێگاو ڕێگا تازە داهێنراوەکان مەکەون، چونکە ئەگەر شوێنی ڕێچکە ڕێگاکان و ڕێگا تازە داهێنراوەکان بکەون پارچە پارچەیی و جیاوازی و ناکۆکی دەخاتە ناوتانەوە، ئا ئەوەیە و بەو شێوەیە خوای پەروەردگارتان فەرمانتان پێ دەکات تا ئێوە خواناس و پارێزگار بن.

ڕێگای ڕاست ئەو ڕێگایەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) بانگەوازی بۆ کردووە ئەویش بریتی یە لە شوێن کەوتنی سوننەت، وە ڕێچکە ڕێگاکان و ڕێگا تازە داهێنراوەکان بریتین لە ڕێگا پارچە پارچەو جیاوازەکانی کەسانی ڕا جیاوازو ئەوانەی کە لایانداوە لە ڕێگای ڕاست کە ئەوانیش کەسانی بیدعەچین (أهلُ البدَع)[٥٨] ، ئەم ئایەتە پیرۆزە نەهی دەکات و ڕێگری دەکات لە شوێن کەوتنی هەموو ڕێگاکانی ئەهلی بیدەع[٥٩].

٣ ـ ﴿وَعَلَى اللَّهِ قَصْدُ السَّبِيلِ وَمِنْهَا جَائِرٌ ۚ وَلَوْ شَاءَ لَهَدَاكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩﴾﴾ (النحل: ٩)

---

[٥٧] بڕوانە: الإعتصام للشاطبي، ١/ ٧٠-٧٦.

[٥٨] بڕوانە: الإعتصام للشاطبي، ١/ ٧٦.

[٥٩] بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ١/ ٧٨

واتە: ڕوون كردنەوەی مەنهەج و ڕێبازی حەق و ڕاست لە لای خوای پەروەردگارە (كە بۆی ڕوون كردونەتەوە تا شوێنی بكەون) ئاگادار بن هەندێ ڕێگای چەوت و ناڕاست هەن (بۆی ڕوون كردونەتەوە تا شوێنی نەكەون) خۆ ئەگەر خوای پەروەردگار ویستی لێبوایە ئەوە هەمووتانی هیدایەت دەدا بۆ سەر ئەو ڕێگا ڕاستە، بەڵام خوای پەروەردگار سەر پشكی كردوون تا بە ویستی خۆتان شوێنی ڕێگای ڕاست بكەون و لە ڕێگای چەوت و ناڕاست دوور بكەونەوە.

﴿قَصدُ السَّبِيلِ﴾ بریتیە لە ڕێگای ڕاست و مەنهەج و ڕێبازی حەق، وە جگە لەو ڕێگایە داهێنان و شوێن كەوتنی هەر ڕێگایەكی تر لادانە لەو ڕێگا ڕاستە، كە ئەویش ڕێگاكانی كەسانی بیدعەچی و سەرلێشێواوەكانە[٦٠].

٤ ـ ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗا لَّسۡتَ مِنۡهُمۡ فِي شَيۡءٍۚ إِنَّمَآ أَمۡرُهُمۡ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴿١٥٩﴾ ﴾ (الأنعام: ١٥٩).

واتە: بەڕاستی ئەوانەی كە ئاینەكەیان پارچە پارچە كردوو بوونە بەش بەش تۆ ﴿ئەی پێغەمبەر (ﷺ)﴾ بەهیچ جۆرێك لەوان نیت و شوێنیان ناكەویت بەڵكو لێیان بەریت، بەڕاستی ئەوانە كارو باریان بۆلای خوای پەروەردگارە و تۆڵەی لادانیان لێدەستێنێتەوە، وە لە مەودوا خوای پەروەردگار هەواڵی هەموو ئەو كردەوانەیان پێدەدا كە ئەنجامی دەدەن.

ئەوانەی كە ئاینەكەیان پارچە پارچە كردوەو بوونەتە بەش بەش كەسانی شوێن كەوتوانی هەواو ئارەزو و بیدعەچی و سەرلێشێواوەكانن لەم ئوممەتە[٦١].

٤ ـ ﴿ وَلَا تَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗاۖ كُلُّ حِزۡبِۭ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾ (الروم: ٣١ ـ ٣٢).

---

(٦٠) بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ١/ ٧٨.

(٦١) بڕوانە: الإعتصام للشاطبي، ١/ ١٧٩.

واتە: مەبن لەو کەسانەی کە هاوەڵ بڕیاردەرن بۆ خوای پەروەردگار، ئەوانەی کە ئاینەکەیان پارچە پارچە کردبوو ببوون بەبەش بەش، هەر یەك لەو کۆمەڵ و پارچە پارچانە دڵخۆشن بەو مەنهەج و ڕێبازو بەرنامەیەی کە خۆیان دایان ڕشتووە (وا دەزانن باشترین و چاکترین ڕێگایان گرتۆتە بەر).

٥ - ﴿ فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ ﴾ (النور ٦٣) .

واتە: با ئاگادار بن و بترسن ئەو کەسانەی کە سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەن کە تووشی فیتنە ببن ( کە تاوان و فیتنەی شیرکە) یان توشی سزای زۆر بە ئێش ببن ﴿ بە هۆی سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی پێغەمبەر (ﷺ).

٦ - ﴿ قُلْ هُوَ ٱلْقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ ﴿٦٥﴾ ﴾ (الأنعام ٦٥) .

واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان بڵێ: خوای پەروەردگار ئەو خوایەیە، بە توانایەو دەتوانێت سزای سەختتان لەسەروتانەوە بۆ بنێرێت یان لە ژێر پێتانەوە یان بتانکاتە کۆمەڵ کۆمەڵ و پارچە پارچە، وە تاڵاوی توندو تیژی هەندێکتان بکات بە گەرووی هەندێکتاندا (واتە: بەردەوام ناکۆکی و دووبەرەکیتان تێدا بێت).

٧ - ﴿ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ﴿١١٩﴾ ﴾ (هود ١١٨-١١٩) .

واتە: بەردەوام ئەو خەڵکە جیاوازن لەناو یەکتریدا لە ئایین و بەرنامەو بۆچوندا، تەنها کەسانێك نەبێت کە خوای پەروەردگار ڕەحمی پێ کردوون، کە ناکۆك و پارچە پارچە نین[٦٢].

---

[٦٢] بڕوانە: الاعتصام للشاطبي، ١ /٧٠-٩١

## ۞دووەم: سەرزەنشت كردن و خراپەی بيدعە لە ڕوانگەی فەرمودەكانی پێغەمبەری خواوە (ﷺ)

چەندين فەرمودە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) گێڕدراوەتەوە سەبارەت بە خراپەی بيدعەو ترسان و وريا بوون لێی، لەو فەرمودانە:

١ ـ دايكی ئيمانداران خاتوو عائيشة (رضي الله عنها) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆمانی گێڕاوەتەوە، كە فەرمويەتی: ((من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو رد))[٦٣].

واتە: هەركەسێك شتێكی تازە دابهێنێت و زيادەيەك بكات لەم دينەدا لە كاتێكدا فەرمانی ئێمەی لەسەر نييە (وە بنچينەيەكی شەرعی نييە تا ئەو كارەی بۆ سەر بگێڕدرێتەوە) ئەوە ئەو كارەی قەبوڵ نييە و لێی وەرناگيرێت، با چەندێ نيەتيشی باش بێت و بڵێت تەنها بۆ خوای پەروەردگار ئەم كارە دەكەم.

٢ ـ وە جابری كوڕی عبد الله (ﷺ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆمانی گێڕاوەتەوە، كە پێغەمبەر (ﷺ) لەسەرەتای دەست پێكردنی ووتارەكانيدا دەيفەرمو: ((أما بعد: فإن خير الحديث كتاب الله، وخير الهدي هدي محمد (ﷺ)، وشر الأمور محدثاتها، وكل بدعة ضلالة))[٦٤].

واتە: پاش ئەمە: بێ گومان باشترين و چاكترين فەرموودە قورئانی پيرۆزی خوايە، وە باشترين و چاكترين ڕێبازو مەنهەج،ڕێباز و مەنهەجی پێغەمبەری خوايە (ﷺ)، وە خراپترينی كارەكان بيدعەو كارە تازە داهێنراوەكانن، وە هەموو بيدعەو كارێكی تازە داهێنراو لە ديندا گومڕايی و سەرلێشێواويە.

٣ ـ وە لە ڕيوايەتێكی تردا كە ئيمامی النَّسائي بۆمانی گێڕاوەتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) لەسەرەتای دەست پێكردنی ووتارەكانيدا (پاش ئەوەی

---

[٦٣] متفق عليه: البخاري، برقم ٢٦٩٧، ومسلم برقم ١٧١٨.

[٦٤] مسلم، كتاب الجمعة، باب تخفيف الصلاة والخطبة، ١/٥٩٢، برقم ٨٦٧.

سوپاس و ستایشی خوای دەکرد بەو شێوەیەی کە شایستەیە بەو سوپاس و ستایشە) دەیفەرموو: ((من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلله فلا هادي له، إن أصدق الحديث كتاب الله، وأحسن الهدي هدي محمد، وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعةٌ، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار))[٦٥].

**واتە: هەرکەسێك خوای پەروەردگار ڕێنمونی بکات و هیدایەتی بدات ئەوە بە هیچ شێوەیەك گومڕاو سەرلێشێواو نابێت، هەرکەسێك خوای پەروەردگار سەری لێبشێوێنێت (بە هۆی خراپەی خۆیەوە) ئەوە بە هیچ شێوەیەك ڕێنمونی کەرو هیدایەت دەری نییە، بێ گومان ڕاسترین و باشترین فەرموودە قورئانی پیرۆزی خوایە، وە باشترین و چاکترین ڕێباز مەنهەج و ڕێنمونی، ڕێباز و مەنهەج و ڕێنمونی پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، وە خراپترینی کارەکان بیدعەو کارە تازە داهێنراوەکانن، وە هەموو بیدعەو کارێکی تازە داهێنراو لە دیندا گومڕایی و سەرلێشێواویە، وە هەموو گومڕایی و سەرلێشێواویەك لە ئاگری دۆزەخدایە.**

٤ ـ **وە** أبوهريرة (رضي الله عنه) **لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بۆمانی گێڕاوەتەوە، کە فەرمویەتی:** ((مَن دَعا إلى هُدى كانَ لَهُ مِنَ الأجرِ مِثلُ أجورِ مَن تَبِعَهُ، لا يَنقُصُ ذلكَ مِن أجورِهِم شَيئاً، وَمَن دَعا إلى ضَلالةٍ كانَ عَلَيهِ مِنَ الإثمِ مِثل آثامِ مَن تَبِعَهُ، لا يَنقُصُ ذلكَ مِن آثامِهِم شَيئاً))[٦٦].

**واتە: هەرکەسێك دەعوەو بانگەواز بکات بۆ ڕێگای ڕاست و ڕێنمونی چاك و جوان، ئەوە خێرو چاکەی بۆ هەیە بە وێنەی خێرو پاداشتی ئەو کەسانەی کە شوێنی دەکەون، بێ ئەوەی هیچ لە خێرو پاداشتی ئەو کەسانەی کە شوێنی**

---

[٦٥] أصله في صحيح مسلم في الحديث السابق ، وأخرجه النسائي بلفظه ، في كتاب صلاة العيدين، باب كيف الخطبة، ١٨٨/٣، برقم ١٥٧٨.

[٦٦] رواه مسلم ، كتاب العلم، باب من سن سنة حسنة أو سيئة، ومن دعا إلى هدى أو ضلالة، ٢٠٦٠/٤، برقم ٢٦٧٤.

دەكەون كەم ببێتەوە، وە هەركەسێك دەعوەو بانگەواز بكات بۆ ڕێگای خراپەو تاوانكاری و سەرلێشێواوی ئەوە خراپەو تاوانی بۆ دەنوسرێت بە وێنەی خراپەو تاوانی ئەو كەسانەی كە شوێنی دەكەون، بێ ئەوەی هیچ لە خراپەو تاوانی ئەو كەسانەی كە شوێنی دەكەون كەم ببێتەوە.

دەی كەسی بیدعەچی كاتێك بیدعە دەكات و خەڵكیش فێری بیدعە دەكات با ئاگادار بێت و باش بزانێت كە هەر بیدعەیەك خەڵكی لێوەی فێر دەبن و دەیكەن هەموو تاوانەكەی بۆ دەنوسرێت بێ ئەوەی هیچ لە خراپە و تاوانی ئەو كەسانەی كە شوێنی دەكەون كەم بكات.

٥ ـ جَرِيـري كوڕی عَبـد الله (ﷺ) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((مَن سَنَّ في الإسلامِ سَنَةً حَسَنَةً فَلَهُ أجرُها وأجرُ مَن عَمِلَ بِها بَعدَهُ، مِن غَيرِ أن يَنقُصَ مِن أُجُورِهِم شَيء، وَمَن سَنَّ في الإسلامِ سَنَةً سَيِّئَةً كانَ عَلَيهِ وِزرُها وَوِزرُ مَن عَمِلَ بِها مِن بَعدِهِ مِن غَيرِ أن يَنقُصَ مِن أوزارِهِم شيءٌ))[٦٧].

واتە: هەركەسێك ڕێگایەكی چاك و جوان دابنێت لەئیسلامدا یان زیندووی بكاتەوە (لە كاتێكدا ئەو ڕێگا باشە بنچینەیەكی شەرعی هەبێت لە دیندا نەك كەسێك بێت و بە بۆچونی خۆی كارێك بەباش بزانێت و موسڵمانانی بۆ هان بدات، چونكە هیچ ڕێگەو كارێك بە بیرو بۆچونی مرۆڤەكان بەباش نازانرێت مەگەر شەرع بە باشی زانیبێت، وە ئەم فەرمودەیە بە هیچ شێوەیەك نابێتە بەڵگە لە سەر دروستێتی كردنی بیدعە بەڵكو هەموو بیدعەو تازە داهێنراوێك لە دیندا ڕەت دەكاتەوە) ئەوە خێرو پاداشتی تەواوی ئەو چاكەیەی بۆ دەنوسرێت، وە خێرو پاداشتی هەموو ئەو كەسانەی بۆ دەنوسرێت كە لە سەر ئەو ڕێگا ڕاست و چاكەن، بێ ئەوەی هیچ لە خێرو پاداشت و چاكەكانی ئەو كەسانەی كە شوێنی

---

[٦٧] رواه مسلم، كتاب الزكاة، باب الحث على الصدقة ولو بشق تمرة، ٢/٧٠٥، برقم ١٠١٧.

دەکەون کەم ببێتەوە، وە هەرکەسێك ڕێگایەکی خراپ و تاوانکاری لە ئیسلامدا دابنێت ئەوە تاوانی ئەو کارەی بۆ دەنوسرێت، وە تاوان و خراپەکاری ئەو کەسانەی شوێنی دەکەون و کار بەو خراپەیە دەکەن لە پاش خۆی، بێ ئەوەی هیچ لە خراپەو تاوانەکانی ئەو کەسانەی کە شوێنی دەکەون کەم ببێتەوە.

٦ ـ عرباضي کوڕی سارية (ﷺ) دەفەرموێت: ((وَعَظَنَا رسولُ الله (ﷺ) مَوعظةً بَليغَةً وَجلَتْ منْهَا القُلُوبُ، وَذَرَفَتْ منْهَا العُيُونُ، فَقُلْنَا :يَا رسولَ الله، كَأَنَّهَا مَوْعظَةُ مُوَدِّعٍ فَأَوْصِنَا، قَالَ: أُوصيكُمْ بتَقْوَى الله، وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَة وَإنْ تَأمَّر عَلَيْكُمْ عَبْدٌ حَبَشيٌّ، وَإنَّهُ مَنْ يَعشْ منْكُمْ فَسَيَرَى إختلافاً كَثيراً، فَعَلَيْكُمْ بسُنَّتي وسُنَّة الخُلَفَاء الرَّاشدينَ المَهْديِّينَ عَضُّوا عَلَيْهَا بالنَّواجذ، وَإيَّاكُمْ وَمُحْدَثَات الأُمُورِ؛ فإنَّ كلَّ بدعة ضلالة))[٦٨].

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئامۆژگاری کردین، ئامۆژگاریەك بوو دڵەکان پێی دەهاتنە لەرزە، وە چاوەکان فرمێسکی پێدا دەهاتە خوارەوە، ووتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێ دەچێت ئەمە کۆتا ئامۆژگاری و ئامۆژگاری ماڵ ئاوایی بێت؟ ئامۆژگاری خێرمان بکە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ئامۆژگاریتان دەکەم بەوەی کە تەقوای خوای پەروەردگار بکەن و لێی بترسن، وە گوێ گرو گوێڕایەڵ بن بۆ ئەمیرو کاربەدەستانتان (لە موسڵمانان) ئەگەر بەندەیەکیش بکرێتە گەورەو کاربەدەستتان (هیچ کاتێك کۆیلە نا کرێتە ئەمیرو گەورەو کار بەدەستی موسڵمانان، بەڵام مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ) نمونە هێنانەوەیە بۆ زیاتر گوێڕایەڵ بوون بۆ ئەمیرو گەورەو کار بەدەستی موسڵمانان)، چونکە ئەی

---

[٦٨] رواه أبو داود، كتاب السنة، باب في لزوم السنة، ٤/٢٠١، برقم ٤٧٠٧، والترمذي، كتاب العلم، باب ما جاء في الأخذ بالسنة واجتناب البدع، ٥/٤٤ برقم ٢٦٧٦،وقال: هذا حديث حسن صحيح، وابن ماجه في المقدمة، باب اتباع سنة الخلفاء الراشدين المهديين، ١/١٥-١٦، برقم ٤٢، ٤٣، ٤٤، وأحمد ٤/٤٦-٤٧، وصححه العلامة الألباني في صحيح سنن ماجه، ٤/٢٠٠ برقم ٤٦٠٧.

هاوەڵانم هەر یەكێك لە ئێوە تەمەنی لە من درێژ تر بێت و دوای من بژێت ئەوە ناكۆكی و دووبەرەكیەكی یەكجار زۆر دەبینێت (لەناو موسڵمانان)، بۆیە هەركاتێك ئەو ناكۆكی و دووبەرەكیەتان بینی دەست بگرن بە سوننەتەكانی من و مەنهەج و رێبازی خەلیفە رێپیشاندەرو هیدایەت دراوەكانم، سوور بن لەسەر دەست گرتن پێیانەوە وەكو چۆن بە كاكیلەكانتان شتێك دەگرن بە توندی، وە ئامۆژگاریتان دەكەم و دەتان ترسێنم لە هەموو بیدعەو كارە تازە داهێنراوەكان لە دیندا، چونكە هەموو بیدعەو تازە داهێنراوێك لەدیندا گومڕایی و سەرلێشێواوییە.

٧ ـ حذیفة (ﷺ) دەفەرموێت: ((كَانَ النَّاسُ يَسْأَلُونَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) عَنِ الْخَيْرِ، وَكُنْتُ أَسْأَلُهُ عَنِ الشَّرِّ مَخَافَةَ أَنْ يُدْرِكَنِي، فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا كُنَّا فِي جَاهِلِيَّةٍ وَشَرٍّ، فَجَاءَنَا اللَّهُ بِهَذَا الْخَيْرِ، فَهَلْ بَعْدَ هَذَا الْخَيْرِ مِنْ شَرٍّ قَالَ « نَعَمْ » قُلْتُ وَهَلْ بَعْدَ ذَلِكَ الشَّرِّ مِنْ خَيْرٍ قَالَ «نَعَمْ، وَفِيهِ دَخَنٌ » قُلْتُ وَمَا دَخَنُهُ قَالَ « قَوْمٌ يَهْدُونَ بِغَيْرِ هَدْيِي تَعْرِفُ مِنْهُمْ وَتُنْكِرُ» قُلْتُ فَهَلْ بَعْدَ ذَلِكَ الْخَيْرِ مِنْ شَرٍّ قَالَ «نَعَمْ دُعَاةٌ إِلَى أَبْوَابِ جَهَنَّمَ، مَنْ أَجَابَهُمْ إِلَيْهَا قَذَفُوهُ فِيهَا» قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ صِفْهُمْ لَنَا فَقَالَ «هُمْ مِنْ جِلْدَتِنَا، وَيَتَكَلَّمُونَ بِأَلْسِنَتِنَا» قُلْتُ فَمَا تَأْمُرُنِي إِنْ أَدْرَكَنِي ذَلِكَ قَالَ «تَلْزَمُ جَمَاعَةَ الْمُسْلِمِينَ وَإِمَامَهُمْ». قُلْتُ فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُمْ جَمَاعَةٌ وَلاَ إِمَامٌ قَالَ «فَاعْتَزِلْ تِلْكَ الْفِرَقَ كُلَّهَا، وَلَوْ أَنْ تَعَضَّ بِأَصْلِ شَجَرَةٍ حَتَّى يُدْرِكَكَ الْمَوْتُ وَأَنْتَ عَلَى ذَلِكَ))[٦٩].

---

[٦٩] متفق عليه: البخاري، كتاب الفتن، باب كيف الأمر إذا لم تكن جماعة، ٨/١١٩، برقم ٧٠٨٤، ومسلم، كتاب الإمارة، باب وجوب ملازمة جماعة المسلمين عند ظهور الفتن وفي كل حال، وتحريم الخروج على الطاعة، ومفارقة الجماعة، ٣/١٤٧٥، برقم ١٨٤٧.

واتە: خەڵکی پرسیاریان لە پێغەمبەر (ﷺ) دەکرد دەربارەی خێر (کام کارە خێرە) بەڵام من پرسیارم لێی دەکرد ئایا کام کارە خراپە و شەڕە لە ترسی ئەوەی کە توشم نەبێت؟

بۆیە ووتم: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئێمە کاتی خۆی (پێش ئیسلامەتیمان) لە نەفامی و خراپەکاریدا بووین، ئەنجا خوای پەروەردگار ئەم خێرەی بۆ هێنایـن (واتە ئیسلام)، ئایا دوای خێرە خراپەکاری دێتەوە؟

فەرموی: بەڵێ، ووتم: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئایا دوای ئەو خراپەیە جارێکی تر خێر دەگەڕێتەوە؟

فەرمووی: بەڵێ، بەڵام پاك و خاوێن نابێت بەڵکو لێڵی و ئاڵۆزی تێدایە و دڵەکان ناکۆکن و ڕق و کینەیان تێدایە.

ووتم: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) لێڵی و ئاڵۆزیەکەی چۆنەو لە چیدایە؟

فەرمووی: کەسانێك مەنهەج و ڕێبازێك دەگرنە بەر کە دوورە لە سوننەتی من، وە خەڵکی بانگ دەکەن و ڕێنموونیان دەکەن بە ڕێگەیەك کە ڕێگا و مەنهەج و ڕێبازی من نییە.

ووتم: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئایا دوای ئەم ئیسلام و خێرە شەڕو خراپە هەیە؟

فەرمووی: بەڵێ، کۆمەڵە بانگەواز کارێك خەڵکی بانگ دەکەن بۆ گومڕایی و سەرلێشێواوی، وە ڕێگریان لێ دەکەن و لە خێرەوە بۆ خراپەو لە سوننەتەوە بۆ بیدعەیان دەبەن، وەستاون لەسەر لێواری دۆزەخ هەرکەسێك وەڵامیان بداتەوە و شوێنیان بکەوێت بەرەو ناو ئاگری دۆزەخی دەبەن (واتە: کەسانێك بە ناو دینەوە بانگەواز دەکەن بۆ کردنی کۆمەڵە کارێك کە هەرکەسێك ئەو کارانە بکات شایستەی چونە ناو ئاگری دۆزەخ دەبێت، وە ئەو کەسانەی کە بانگەواز دەکەن

(بە ناوی دینداریییەوە) بۆ كردنی ئەو كارانە وەكو كەسانێك وان كە لەسەر لێواری دۆزەخ وەستا بن، هەركەسێك وەڵامیان بداتەوە بەرەو دۆزەخ ڕایدەكێشن).

ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەسفیان بكە و باسیان بكە بۆمان.

فەرمووی: بەڵێ: كەسانێك لە ڕەگەزو میللەتی خۆمانن و بە زمانی ئێمەش قسە دەكەن (موسڵمانن بانگەواز بۆ دینداری دەكەن).

حذيفة (ﷺ) دەفەرموێت: ووتم ئەی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانم بە چی پێ دەكەیت ئەگەر تووشی ئەوانە بووم؟

فەرموی: دەست بگرە بە كۆمەڵی موسڵمانان و ئیمام و پێشەواكەیانەوە (واتە: گوێڕایەڵی پێشەوای موسڵمانان بكەو لە گەڵ كۆمەڵی موسڵماناندابە).

ووتم: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر لەو كاتەدا نە پێشەواو نە كۆمەڵی موسڵمانان هەبوو چی بكەم؟ (یەك پێشەواو یەك كۆمەڵی ڕاستەقینەی لەسەر حەق نەبوو) فەرموی: خۆت بەدوور بگرە لەو هەموو پارچە پارچەیی و دووبەرەكییە، ئەگەر قەپت كردووە بە ڕەگی درەختێكدا هەتا دەمریت بەو حاڵەوە، وە بەو شێوەیە بمێنیتەوە، واتە: ئەوە باشترە وەك لەگەڵ ئەو هەموو پارچە پارچەیی و دووبەرەكییەدا بیت، یان لەگەڵ یەكێكیاندا بیت.

٨ ـ وە لە فەرمودەیەكدا كە زَيدي كوڕی أرقَم (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە، كە فەرمویەتی: ((أَمَّا بَعْدُ: أَلاَ أَيُّهَا النَّاسُ فَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ يُوشِكُ أَنْ يَأْتِيَ رَسُولُ رَبِّي فَأُجِيبَ وَأَنَا تَارِكٌ فِيكُمْ ثَقَلَيْنِ أَوَّلُهُمَا كِتَابُ اللَّهِ فِيهِ الْهُدَى وَالنُّورُ [هُوَ حَبلُ اللهِ المَتِين مَنِ اتَّبَعَهُ كانَ عَلَى الهُدى، وَمَن تَرَكَهُ كانَ عَلَى الضَّلالَة] فَخُذُوا بِكِتَابِ اللَّهِ وَاسْتَمْسِكُوا بِهِ» فَحَثَّ عَلَى كِتَابِ اللَّهِ وَرَغَّبَ فِيهِ))[٧٠].

واتە: پاش ئەمە، ئاگاداربن ئەی خەڵكینە (موسڵمانان) منیش مرۆڤێكم وەكو ئێوە پێدەچێت ڕۆژێك نێردراوی خوای پەروەردگار بێت و (فریشتەی گیان

---

[٧٠] رواه مسلم، كتاب فضائل الصحابة، باب فضائل علي بن أبي طالب ﷺ، ٤/١٨٧٣، برقم ٢٤٠٨.

کێشان) منیش وەڵامی بدەمەوە (بمرم) بەڵام پاش مردنی خۆم دوو شتتان بۆ جێدەهێڵم ئەگەر دەستیان پێوە بگرن هەرگیز گومڕاو سەرلێشێواو نابن: کیتابی خوای پەروەردگار کە قورئانی پیرۆزە، ئەو قورئانەی کە ڕێنمونی و ڕوناکی تێدایە، پەتی بە هێزی خوای پەروەردگارە کە ئەگەر هەر کەسێك شوێنی بکەوێت ئەوە بێگومان لەسەر هیدایەت و ڕێنمونییە، وە هەر کەسێك وازی لێبێنێت و پشت گوێی بخات ئەوە بەڕاستی لە گومڕایی و سەرلێشێواویدایە، ئاگادارتان دەکەمەوە کە دەست بگرن بە قورئانی پیرۆزی خوای پەروەردگارەوە، وە پەیوەست بن پێیەوە، پێغەمبەر (ﷺ) هانی موسڵمانانی دەدا تا دەست بگرن بە قورئانی پیرۆزەوە.

٩ ـ وە أبو هريرة (ﷺ) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((يَكُونُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ دَجَّالُونَ كَذَّابُونَ يَأْتُونَكُمْ مِنَ الأَحَادِيثِ بِمَا لَمْ تَسْمَعُوا أَنْتُمْ وَلاَ آبَاؤُكُمْ فَإِيَّاكُمْ وَإِيَّاهُمْ لاَ يُضِلُّونَكُمْ وَلاَ يَفْتِنُونَكُمْ))[71].

واتە: لە کۆتایی دونیادا کەسانیکی زۆر درۆزن و تەڵەکەباز پەیدا دەبن، فەرموودەی واتان بۆ دەگێڕنەوە کە نە ئێوە و نە باوو باپیرانیشتان گوێتان لە شتی وا نەبووە، بۆیە ئاگادارتان دەکەمەوە نە لە گەڵیاندا بن و نە نزیکیان بکەونەوە، بۆ ئەوەی تووشی فیتنەو گومڕایی و سەرلێشێواویتان نەکەن.

---

[71] رواه مسلم، في المقدمة، باب النهي عن الرواية عن الضعفاء والاحتياط في تحملها، ١/١٢، برقم ٦، ٧، وابن وضاح في ما جاء في البدع، ص ٦٧، برقم ٦٥.

## ۞ سێیەم: لە وتەکانی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بە بیدعە

١ ـ ئیمامی أبوبکر (ﷺ) فەرمویەتی: (ئەی خەڵکینە وریابن من تەنها شوێن کەوتووی پێغەمبەرم (ﷺ) بیدعەچی نییم و شتی تازە دانا هێنم لەم دینەدا، بۆیە هەر کارێکم کرد ئەگەر ڕاست و دروست بوو ئێوەش یارمەتی دەرم بن، وە هەر کارێکم کرد لامداو هەڵەبوو ئێوە ڕاستم بکەنەوە)[٧٢].

٢ ـ ئیمامی عُمَر (ﷺ) فەرمویەتی: (ئاگادارتان دەکەمەوەو دەتان ترسێنم لە هەڵس و کەوت کردن لە گەڵ کەسانی شوێن کەوتووی هەواو ئارەزوی خۆیان، چونکە ئەو کەسانە دوژمنی سوننەتی پێغەمبەرن(ﷺ)، ئەوانە بە بۆچونی خۆیان قسە دەکەن (لە دیندا) بۆیە کەسانێکی سەرلێشێواون و سەر لە خەڵکیش دەشێوێنن و گومڕایان دەکەن[٧٣].

٣ ـ عبدالله کوڕی مسعود (ﷺ) دەفەرموێت: (شوێن کەوتووی قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بن، شتی تازە دامەهێنن لەم دینەدا و بیدعەچی مەبن، چونکە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەرتان (ﷺ) بەسە تا شوێنی بکەون، وە هەموو بیدعەو تازە داهێنراوێك لەم دینەدا گومڕایی و سەرلێشێواوییە)[٧٤].

---

[٧٢] بروانە: الطبقات الكبرى، ٣/١٣٦.

[٧٣] أخرجه اللالكائي، في شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة، ١/١٣٩، برقم ٢٠١، والدارمي في سننه، ١/٤٧، برقم ١٢١، وابن عبد البر في جامع بيان العلم وفضله، ٢/١٠٤١، برقم ٢٠٠١، ورقم ٢٠٠٣، ورقم ٢٠٠٥.

[٧٤] أخرجه ابن وضاح في ما جاء في البدع، ص٤٣، برقم ١٤، ١٢، والطبراني في المعجم الكبير، ٩/١٥٤، برقم ٨٧٧٠، وقال الهيثمي في مجمع الزوائد، ١/١٨١: "ورجاله رجال الصحيح"، وأخرجه اللالكائي في شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة، ١/٩٦، برقم ١٠٢، وانظر آثارًا أخرى عن عبد الله بن مسعود (ﷺ) في ما جاء في البدع لابن وضاح ص ٤٥، ومجمع الزوائد، ١/١٨١.

## ۞ چوارەم: لە ووتەکانی تابعیە بەڕێزەکان و شوێن کەوتوانیان سەبارەت بە بیدعە

١ - عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (ڕەحمەتی خوای لێبێت) جارێکیان کیتابێکی نووسی بۆ پیاوێك تیایدا ووتبوی: (أما بعد، أوصيك بتقوى الله، والاقتصاد في أمره، واتباع سنة نبيه ﷺ، وترك ما أحدث المحدثون بعد ما جرت به سنته)[٧٥].

واتە: ئامۆژگاریت دەکەم بە تەقوای خوای پەروەردگار (بیپەرستیت و لێی بترسیت)، وە ئامۆژگاریت دەکەم بە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوای پەروەردگار بە شێوەیەکی مام ناوەند کە نەزۆر زیادە ڕەوی تێدا بکەیت و نە کەم تەرخەم بیت تێیدا، وە ئامۆژگاریت دەکەم بە بە جێبەجێ کردن و شوێن کەوتنی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)، وە ئامۆژگاریت دەکەم بە دوور کەوتنەوەو واز هێنان لەو ووتەو کارانەی کە کەسانی بیدعەچی دایان هێناوە پاش ئەوەی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) وابووە و بەو شێوەیە بڕیاری لەسەرداوە.

٢ - ئیمامی حەسەنی بەصری (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: (لا يصح القول إلا بعمل، ولا يصح قول وعمل إلا بنية، ولا يصح قول وعمل ونية إلا بالسنة)[٧٦].

واتە: هیچ ووتەیەك ڕاست و تەواو نییە بە کار پێکردنی نەبێت، وە هیچ ووتەو کردەوەیەك ڕاست و تەواو نییە بەبێ نیەتی باش، وە هیچ ووتەو کردەوەو نیەتێك ڕاست و تەواو نییە بەبێ شوێن کەوتنی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ).

بۆیە هیچ ووتەو کردەوەو نییەتێك وەرگیراو نییە لای خوای پەروەردگار ئەگەر پێچەوانەی مەنهەج و ڕێباز و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بێت.

---

[٧٥] سنن أبي داود، كتاب السنة، باب لزوم السنة، ٤/٢٠٣، برقم ٤٦١٢، وانظر: صحيح سنن أبي داود، للألباني، ٣/٨٧٣.

[٧٦] أخرجه اللالكائي، في شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة، ١/٦٣، برقم ١٨.

٣ ـ ئیمامی شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: (حُكمِي في أصحاب الكلام أن يضربوا بالجريد، ويحملوا على الإبل ويطاف بهم في العشائر والقبائل، ويقال: هذا جزاء من ترك الكتاب والسنة وأخذ في الكلام)(٧٧).

**واتە: قسەو حوكمی من ئەوەیە كە بە پەلكی دار خورما لەو كەسانە بدرێت كە شوێن (عِلمُ الكَلام) كەوتوون (وازیان لە قورئانی پیرۆز و سوننەت هێناوە)، وە سواری وشتر بكرێن و بەناو عەشیرەت و هۆزەكاندا بگێڕدرێن و بووترێت: ئەمە سزای ئەو كەسانەیە كە پشت لە قورئانی پیرۆز و سوننەت دەكەن و شوێنی (عِلمُ الكَلام) دەكەون.**

٤ ـ ئیمامی مالك (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: (من ابتدع في الإسلام بدعة يراها حسنة فقد زعم أن محمداً ﷺ خان الرسالة، لأن الله يقول: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ ۝٣﴾ (المائدة)، فما لم يكن يومئذ ديناً، فلا يكون اليوم ديناً)(٧٨).

**واتە: هەر كەسێك بیدعەو زیادەیەك لە ئیسلامدا دابهێنێت و گومانی وابێت كارێكی باشە و بیدعەیەكی حەسەنەیە ئەوە ئەو كەسە گومانی وایە كە پێغەمبەر (ﷺ) خیانەتی كردووە لە گەیاندنی ئەم دینە، چونكە خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ئەمڕۆ دینم بۆ تەواوو كامل كردوون (بە هیچ شێوەیەك نابێت لێی زیاد بكرێت هەر وەك چۆن نابێت لێی كەم بكرێت) بۆیە هەر ووتەو كارێك لەو ڕۆژەدا دین نەبووبێت ئەوە بە هیچ شێوەیەك ئەمڕۆ نابێت بە دین.**

٥ ـ ئیمامی أحمد (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرمووێت: (أصول السنة عندنا التمسك بما كان عليه أصحاب رسول الله ﷺ، والإقتداء وترك البدع، وكل بدعة

---

(٧٧) أخرجه أبو نعيم في الحلية، ٩/١١٦.

(٧٨) بڕوانە: الإعتصام، للإمام الشاطبي، ١/٦٥.

ضلالة، وترك الخصومات، والجلوس مع أصحاب الأهواء، وترك المراء والجدال والخصومات في الدين)[٧٩].

واتە: بنچینەکانی سوننەت لای ئێمە بریتیە لە: دەست گرتن بەو ووتەو کارانەی کە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەری بوونە، وە شوێن کەوتنیان و واز هێنان لە بیدعە، چونکە هەموو بیدعەیەك سەرلێشێواویە، وە واز هێنان لە دوو بەرەکی ناکۆکی، وە دوور کەوتنەوە و دانەنیشتن لە گەڵ کەسانی شوێن کەوتووی هەواو ئارەزو و بیدعەچی، وە دوور کەوتنەوە لە موناقەشەو دەمە دەمێ کردن و دوو بەرەکی و ناکۆکی لە دیندا.

## ۞ پێنجەم: بیدعە سەرزەنشت کراوە لە چەند ڕوویەکەوە:

١ ـ ئەوەی زانراوە و سەلمێنراوە بە تاقی کردنەوە ئەوەیە: عەقڵ ناتوانێت هەموو خێرو چاکەو بەرژەوەندییەکانی خۆی دیاری بکات بە بێ شوێن کەوتنی قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)، بۆیە بیدعە پێچەوانەی شوێن کەوتنی قورئان و سوننەتە.

٢ ـ شەریعەتی ئیسلام کامل و تەواوە لە هەموو ڕوویەکەوە، بۆیە بە هیچ شێوەیەك نە زیادەو (بیدعە) نە کەم و کوڕی وەرناگرێت.

٣ ـ کەسی بیدعەچی شوێن کەوتووی هەواو ئارەزووی خۆیەتی، دژایەتی شەرع دەکات و لە شەرع لایداوە.

٤ ـ بیدعەچی شوێنی هەواو ئارەزوی خۆی کەوتووە، بۆ؟ لەبەر ئەوەی عەقڵ هەرکاتێك شوێنی شەرع نەکەوێت ئەوە بێگومان شوێنی هەواو ئارەزوو کەوتووە.

---

[٧٩] بڕوانە: شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة، للالكائي، ١/١٧٦.

٥ ـ بیدعەچی خۆی خستۆتە ئاستی شەرع دانەر کە خوای پەروەردگار و پێغەمبەرە (ﷺ)، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار و پێغەمبەر (ﷺ) شەرعیان داناوەو فەرمانیان بە مرۆڤ و جنۆکەکان کردووە تا لەسەری بڕۆن لێی لانەدەن، بەڵام کەسی بیدعەچی فەرمان دەکات بە خەڵکی بە پێچەوانەی فەرمانی خواو پێغەمبەر (ﷺ).

## ۞ باسی چوارەم: هۆکارەکانی بیدعە کردن

چەندین هۆکار هەیە کە سەر دەکێشێت بۆ بیدعە کردن، لەو هۆکارانەی کە دەبێتە مایەی ئەنجامدانی بیدعە ئەمانەن:[1]

١ ـ **نەزانی و نە شارەزایی**، بەڕاستی دەردێکی زۆر کوشندەو ترسناکە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾ ﴾ (الإسراء: ٣٦) .

واتە: ئەی ئینسان قسە لە شتێك مەكەو شوێنی شتێك مەكەوە كە عیلم و زانیاریت دەربارەی نییە، چونكە بەڕاستی ئەندامەكانی بیستن و بینین و تێگەیشتن (دڵ) هەموویان بەر پرسیارن بەرامبەر ئەو ووتەو كردەوانەی كە بەبێ زانست و زانیاری دەوترێت یان دەكرێت.

وە هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّىَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلْإِثْمَ وَٱلْبَغْىَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُوا۟ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ (الأعراف: ٣٣) .

واتە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) پێیان بڵێ: بەڕاستی پەروەردگاری من هەرچی گوناهو خراپەكاریەكی نهێنی و ئاشكرا هەیە حەرامی كردووە، وە هەموو گوناهو دەست درێژییەكی بە ناحەقی حەرام كردووە، وە حەرامی كردووە لەسەرتان كە

[1] بۆ شارەزابوون لە زۆربەی ئەم هۆکارانە، بڕوانە: الاعتصام لشاطبي، ١ /٢٨٧-٣٦٥.

شتێك بكەن بە هاوەڵ و شەریكی خوای پەروەردگار لە كاتێكدا خوای پەروەردگار هیچ دەسەڵاتی پێنەداوەو هیچ بەڵگەیەكیشی دانەبەزاندووە لە سەر دروستێتی ئەو تاوانە گەورەیە، وە هەروەها خوای پەروەردگار حەرامی كردووە لەسەرتان كە لە خۆتانەوە بەناوی خواوە دوور لە هەموو زانیاری و زانستێك قسە بكەن و شت بڵێن.

عبداللّٰه‌ی كوڕی عَمرِو كوڕی العاص دەفەرموێت: **گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو:** ((إِنَّ اللَّهَ لاَ يَنْتَزِعُ الْعِلْمَ مِنَ النَّاسِ انْتِزَاعًا وَلَكِنْ يَقْبِضُ الْعُلَمَاءَ فَيَرْفَعُ الْعِلْمَ مَعَهُمْ وَيُبْقِي فِي النَّاسِ رُءُوسًا جُهَّالاً يُفْتُونَهُمْ بِغَيْرِ عِلْمٍ فَيَضِلُّونَ وَيُضِلُّونَ))[٨٠].

**واتە: خوای پەروەردگار عیلم و زانیاری بە یەك جاری لە نێوان موسڵماناندا هەڵناگرێتەوە، بەڵام بە مردنی زانایان عیلم و زانیاری لە ناو موسڵماناندا بەرز دەكاتەوە، بە مردنیان زانیاری لە گەڵیاندا دەڕوات و نامێنێت، بۆیە لە ناو موسڵماناندا كەسانێكی زۆر نەزان و نەفام دەمێننەوە، فەتوا بۆ موسڵمانان دەدەن بەبێ عیلم و زانیاری، بۆیە خۆیان سەرلێشێواون و سەریش لە موسڵمانان دەشێوێنن (گومڕان و خەڵكیش گومڕا دەكەن).**

**٢ - شوێن كەوتنی هەواو ئارەزوو: یەكێك لەو هۆكارە ترسناكانەی كە موسڵمان بە هۆیەوە تووشی بیدعە دەبێت بریتیە لە شوێن كەوتنی هەواو ئارەزوو، خوای پەروەردگار دەفەرموێت:** ﴿ يَـٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلۡنَـٰكَ خَلِيفَةً فِي ٱلۡأَرۡضِ

---

[٨٠] متفق عليه: البخاري، كتاب الاعتصام بالكتاب والسنة، باب ما يذكر من ذم الرأي وتكلف القياس، ١٨٧/٨، برقم ٧٣٠٧، ومسلم، كتاب العلم، باب رفع العلم وقبضه وظهور الجهل والفتن آخر الزمان، ٢٠٥٨/٤، برقم ٢٦٧٣.

فَٱحۡكُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلۡهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدُۢ بِمَا نَسُواْ يَوۡمَ ٱلۡحِسَابِ ﴿٢٦﴾ ﴾ (ص: ٢٦) .

واتە: ئەی داود (ﷺ) بەڕاستی ئێمە تۆمان كردۆتە جێنشین لەم وڵاتـەدا، فەرمانڕەوایی لـە نێوان خەڵكدا بكـە لەسـەر بنـچینەی حـەق و ڕاسـتی، هـەرگیز شوێنی هەواو ئارەزو مەكەوە، چونكە دەبێتە هۆی گومڕابوون و لادانت لە ڕێگـای خوای پـەروەردگار، چـونكە بەڕاسـتی ئەوانـەی كـە لایـان داوە لـە ڕێبـازی خـوا، سـزای بـە ئـێش و پـڕ بـەئازاریان بـۆ هەیـە، بـە هـۆی پـشت گـوێ خـستنی لێپرسینەوەی ڕۆژی دوایی.

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا ﴿٢٨﴾ ﴾ (الكهف: ٢٨) .

واتـە: ئـەی پێغەمبـەر (ﷺ) گوێڕایـەڵی كەسـێك مەكـەو شـوێنی كەسـێك مەكەوە كە ئێمە دڵیمان بێ ئاگا كردووە لە زیكرو یادی خۆمـان (بـە هـۆی دونیـا ویـستیەوە) وە ئـەو كەسـە شـوێنی هـەواو ئـارەزوی خـۆی كـەوتووە و هـەموو كارەكانی بێ سەرو بەرەیەو لە سنور دەرچووە.

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ أَفَرَءَيۡتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلۡمٖ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمۡعِهِۦ وَقَلۡبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةٗ فَمَن يَهۡدِيهِ مِنۢ بَعۡدِ ٱللَّهِۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ (الجاثية) .

واتە: ئایا نابینی ئەو كەسەی كە شـوێنی هـەواو ئـارەزوی خـۆی كـەوتووەو كردوویەتی بە خوای خۆی، خوای پەروەردگاریش بە هۆی ئەو كارەیەوە گـومڕای كـردووە (زانیـوێتی كـە شایـستەی ئەوەیـە) وە خـوای پـەروەردگار مـۆری داوە بەسەر گوێ و دڵ و دەرونیدا، وە پەردەی هێناوە بەسـەر چاویدا، جـا ئـیتر كـێ هەیە ڕێنمونی بكات و هیدایەتی بدات جگـە لـە خـوای پـەروەردگار، ئایا بـۆ بـیر ناكەنەوەو ئامۆژگاری وەرناگرن.

وه هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ ٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ ٱللَّهِ ﴾ (القصص ٥٠).

واتـە: كـێ هەيـە لـەو كاسـە گـومڕاو سەرلێـشێواو تـر بێـت كـە شـوێنی ئارەزووەكانی خۆی كەتووە و دوورە لە هیدایەت و ڕێنمونی خوای پەروەردگار.

وه هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٢٣﴾﴾ (النجم: ٢٣).

واتـە: موشـریكان تـەنها شـوێنی هـەواو ئـارەزوو دەروونـە نەخۆشـەكانیان دەكـەون، لـە كاتێكـدا بەڕاسـتی لـە لايـەن خـوای پەروەردگاريانـەوە ڕێنمـونی هیدایەتیان پێ گەیشتبوو (بەڵام شوێنی نەدەكەوتن).

٢ ـ **شـوێن كـەوتن و دڵ پەیوەسـت بـوون بـە شـوبهەكان:** كەسـانی بیدعەچـی كەسـانێكن شـوێنی شـوبهە دەكـەون، هـەر بۆیـە دەكەونـە بیدعـەوە، خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ مِنْهُ ءَايَـٰتٌ مُّحْكَمَـٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَـٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَـٰبِهَـٰتٌ ۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَـٰبَهَ مِنْهُ ٱبْتِغَآءَ ٱلْفِتْنَةِ وَٱبْتِغَآءَ تَأْوِيلِهِۦ ۗ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ ۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿٧﴾ ﴾ (آل عمران: ٧).

واتـە: خـوای پـەروەردگار ئـەو خوايەيـە كـە قورئـانی پـیرۆزی بۆسـەر تـۆ "پێغەمبـەر (ﷺ)" دابەزانـدووە، هەنـدێك لـە ئايەتـەكانی دامـەزراوو ڕوون و ئاشكران، كە بنچینەو بناغەی قورئانی پیرۆزن، وە هەندێك لە ئايەتەكانی ماناو واتای جۆراو جۆر هەڵدەگرن، جا ئەو كەسانەی كە لاری و لادان لـە دڵیانـدا هەيـە حەز لە حەق و ڕاستی ناكەن بەڵكو شوێنی ئەو ئايەتانە دەكەون كە ماناو واتـای جۆراو جۆر هەڵدەگرن بۆ ئەوەی فیتنەو ئاشوب و ناكۆكی و دووبـەرەكی دروسـت بكەن، یان بۆ ئەوەی ماناو واتاكەی بە هەڵە لێك بدەنە، لـە كاتێكـدا لێكدانـەوەی

مانای ئەو ئایەتانە تەنها خوای پەروەردگار بە تەواوی دەیان زانێت، بۆیە كەسانی خاوەن عیلم و زانیاری زۆر شارەزاو ڕۆ لە زانستدا دەڵێن: ئێمە باوەڕی تەواو و دامەزراومان هەیە بە هەموو ئەو ئایەتانەی كە لە لایەن پەروەردگارمانەوەیەو فەرمایشتی ئەوە، بۆیە جگە لە كەسانی خاوەن بیرو هۆشەكان یادەوەری وەرناگرن و بیر ناكەنەوە لەم قورئانە.

٣ ـ **پشت بەستن تەنها بە عەقڵ:** هەر كەسێك تەنها پشت بە عەقڵی خۆی ببەستێت و واز لە قورئانی پیرۆز و سوننەت بهێنێت ئەوە بێگومان كەسێكی گومڕاو سەرلێشێواو بیدعەچی دەبێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٧﴾ ﴾ (الحشر).

واتە: ئەی موسڵمانان ئەوەی كە پێغەمبەر (ﷺ) بۆی هێناون (لە قورئانی پیرۆز و سوننەت) وەریبگرن و هەر فەرمانێكی پێكردن بە گوێی بكەن، وە هەر شتێكی لێ قەدەغە كردن و نەهی لێ كردن یەكسەر لێی دوور بكەونەوە و مەیكەن، چونكە بەڕاستی خوای پەروەردگار زۆر بە توندی تۆڵە دەستێنێت لە كەسانێك كە سەرپێچی فەرمانەكانی پێغەمبەر (ﷺ) دەكەن.

وە هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ ﴾ (الأحزاب: ٣٦).

واتە: بۆ هیچ پیاوو ئافرەتێكی ئیماندار شیاو نییەو دروست نییە، كاتێك خوای پەروەردگار و پێغەمبەرەكەی (ﷺ) بڕیاری شتێك بدەن، ئەوان سەر پشك بن (یان خۆیان بەسەر پشك بزانن) لە ئەنجامدانی ئەو كارەدا، چونكە هەركەسێك سەرپێچی فەرمانەكانی خواو پێغەمبەرەكەی (ﷺ) بكات، ئەوە بێگومان كەسێكی گومڕاو سەرلێشێواوە بە ئاشكرا.

٤ ـ **شوێن کەوتنی کوێرانە و دەمارگیری:** زۆربەی بیدعەچیەکان بە هۆی شوێن کەوتنی کوێرانە بۆ باوو باپیران و گەورەکانیان و دەمارگیری نادروستانەو بێ زانیاریانە بۆ پێشەواو مامۆستاکانیان تووشی بیدعە کردن بوونە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا ﴿١٧٠﴾ ﴾ (البقرة: ١٧٠) .

واتە: ئەگەر بەو خەڵکە بوترێت: شوێنی ئەو بەرنامەو مەنهەج و ڕێبازە بکەون کە خوای پەروەردگار دایبەزاندووە، ئەوان دەڵێن: نەخێر ئێمە تەنها شوێنی ئەوە دەکەوین کە باوو باپیرانمان لەسەری بوونە و کردویانە.

بۆیە ئەهلی بیدەع کەسانی دەرچوو لە ڕێگای ڕاستی قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) کردەوە خراپ و زیادەکانیان (بیدعەکانیان) بۆ ڕازێنراوەتەوە، هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُ سُوءُ عَمَلِهِ فَرَآهُ حَسَنًا فَإِنَّ اللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي مَن يَشَاءُ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَاتٍ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٨﴾ ﴾ (فاطر: ٨) .

واتە: ئایا ئەو کەسەی کە کردەوە ناشیرین و خراپەکانی (بیدعەکانی) بۆ ڕازێنراوەتەوە و بە چاك و جوانی دەزانێت؟! (وەك ئەو کەسە وایە کە پێوەری خوایی پێیە بۆ چاکەو خراپە)، بەڕاستی خوای پەروەردگار بیەوێت هەرکەسێك سەرلێشێواو بکات بە هۆی خراپەکانیەوە ئەوە سەرلێشێواوی دەکات، وە بیەوێت هەرکەسێك هیدایەت بدات ئەوە هیدایەتی دەدات و ڕێنمونی دەکات، بۆیە ئەی پێغەمبەر (ﷺ) تۆ خۆت مەفەوتێنە بە خەفەت خواردن لێیان (کاتێك ئیمان ناهێنن و کردەوەی چاکە ناکەن)، چونکە خوای گەورە زۆر زانایەو بە ئاگایە بەو کارانەی کە ئەوان ئەنجامی ئەدەن.

وە هەروەها خوای پەروەردگار حاڵی كەسانی بێباوەڕو بیدعەچی و شوێن كەوتوانی هەواو ئارەزومان بۆ ڕوون دەكاتەوەو دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ يَقُولُونَ يَا لَيْتَنَا أَطَعْنَا اللَّهَ وَأَطَعْنَا الرَّسُولَا ﴿٦٦﴾ وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَا ﴿٦٧﴾ ﴾ (الأحزاب: ٦٦-٦٧) .

واتە: لەو ڕۆژەدا (كە ڕۆژی قیامەتە) دەم و چاوو ڕوخساریان ئەم دیوو ئەو دیوی پێدەكرێت لە ناو ئاگری دۆزەخدا (تا چاك سزا بكێشن و بسوتێن) لەو كاتەدا بەدەم ناڵەو هاوارەوە دەڵێن: ئای خۆزگە شوێنی فەرمانەكانی خوای پەروەردگار و پێغەمبەر (ﷺ) بكەوتینایەو شوێنی هیچ ڕچەڕێ و مەنهەج و ڕێبازێك نەكەوتینایە، وە دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی ئێمە مل كەچ و گوێڕایەڵی گەورەو دەسەڵاتدارو ئاغاكانمان بووین، بۆیە هەر ئەوان ڕێگەو ڕێبازی حەق و ڕاستیان لێشێواندین و سەرگەردانیان كردین (بۆیە گیرۆدەی ئاگرن و لە ناو دۆزەخدا سزای توند و بە ئێش دەدرێن).

٥ ـ **دانیشتن و تێكەڵاو بوون لە گەڵ كەسانی خراپ و بیدعەچیدا:** یەكێك لەو هۆكارانەی كە موسڵمان بە هۆیەوە تووشی بیدعە دەبێت و بیدعەو خراپەی پێ بڵاو دەبێتەوە بریتیە لە: دانیشتن و تێكەڵاو بوون لە گەڵ كەسانی خراپ و بیدعەچیدا، بۆیە خوای پەروەردگار ئەوەی بۆمان ڕوون كردۆتەوە كە دانیشتن و تێكەڵاو بوون لە گەڵ كەسانی خراپدا پەشیمانی دوارۆژی لە دوایە، هەروەك دەفەرموێت: ﴿ وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ يَا وَيْلَتَىٰ لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴿٢٨﴾ لَّقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَاءَنِي ۗ وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِلْإِنسَانِ خَذُولًا ﴿٢٩﴾ ﴾ (الفرقان: ٢٧-٢٩) .

واتە: ڕۆژێك دێت (كە ڕۆژی قیامەتە) ستەم كارو بێباوەڕ قەپ دەكات بەهەر دوو دەستی خۆیداو گاز لە هەردوو دەستی خۆی دەگرێت لە پەشیمانیدا،

دەڵێت: خۆزگە لە گەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) ڕێگەو ڕێبازی ئیمان و ئیسلامەتیم بگرتایەتە بەر. هاوارو ڕۆڕۆ بۆ خۆم خۆزگە لە دونیادا فلانە کەسم نەکردایەتە هاوەڵ و دۆستی خۆم، چونکە بەڕاستی سەری لێشێواندم و گومڕای کردم. بەڕاستی گومڕاو سەرلێشێواوی کردم لە بەرنامەو ڕێبازی خوا، دوای ئەوەی کە مەنهەج و ڕێبازو بەرنامەی خواو پێغەمبەرم (ﷺ) پێگەیشتبوو، شەیتان هەموو کاتێك هانی مرۆڤ دەدات بۆ بێباوەڕی و خراپەکاری، وە لە دوایشدا پشتی لێ هەڵدەکات.

وە هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ ۚ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ الشَّيْطَانُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَىٰ مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴿٦٨﴾ ﴾ (الأنعام: ٦٨) .

واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك ئەوانەت بینی کە دەم دەخەنە ئایەتەکانی ئێمە و گاڵتە جاڕی پێدەکەن، لەو کاتەدا تۆ پشتیان تێ بکەو کۆڕو دانیشتگاکەیان بەجێ بهێڵە هەتا ئەو کاتەی دەچنە ناو باسێکی ترەوەو (باسی ئایەتەکانی ئێمە ناکەن بە گاڵتە جاڕییەوە) وە ئەگەر شەیتان لەبیری بردیتەوە (کە دوور بکەویتەوە لێیان) پاش بە بیر هاتنەوەت دامەنیشەو کۆڕ مەبەستە لەگەڵ کەسانی بێباوەڕو ستەمکاردا.

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ ۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ جَامِعُ الْمُنَافِقِينَ وَالْكَافِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴿١٤٠﴾ ﴾ (النساء: ١٤٠) .

واتە: بەڕاستی خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا بۆی دابەزاندوون و فەرمانی پێ کردوون: کە هەر کاتێك لە جێیەکدا گوێتان لێ بوو کوفرو بێباوەڕی و گاڵتەجاڕی بە ئایەتەکانی خوا دەکرا، ئەوە ئەی (موسڵمانان) دامەنیشن لەگەڵ

ئەوانەدا هەتا باسەكەیان نەگۆڕن، بۆیە ئەگەر ئێوە دابنیشن و گوێ نەدەن بە فەرمانی خوا، ئەوە بێگومان ئێوەش لەو كاتەدا وەكو ئەوانن، بەڕاستی خوای پەروەردگار هەموو دوو ڕووەكان و بێباوەڕەكان لە ناو دۆزەخدا كۆدەكاتەوەو سزایان دەدات.

وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((مَثَلُ الْجَلِيسِ الصَّالِحِ وَالْجَلِيسِ السُّوءِ؛ كَحَامِلِ الْمِسْكِ، وَنَافِخِ الْكِيرِ؛ فَحَامِلُ الْمِسْكِ إِمَّا أَنْ يُحْذِيَكَ، وَإِمَّا أَنْ تَبْتَاعَ مِنْهُ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحًا طَيِّبَةً، وَنَافِخُ الْكِيرِ إِمَّا أَنْ يُحْرِقَ ثِيَابَكَ، وإِمَّا أَنْ تَجِدَ رِيحًا خَبِيثَةً))[٨١].

واتە: نمونەی كۆڕو دانیشتن لە گەڵ كەسی چاكدا، وەهاوڕێیەتی كردن و دانیشتن لە گەڵ كەسی خراپدا، وەكو: هەڵگری بۆنی میسك (بۆن فرۆش) و فوكەر بە كورەدا (ئاسنگەر)وایە، بۆیە هاوڕێیەتی كردنی كەسی یەكەم وەكو بۆن فرۆشێك وایە یان ئەوەتا بۆنی خۆشی لێ دەكڕیت، یان بۆنی خۆشت پێدەبەخشێت، یان بۆنی خۆشی لێ دەبینیت و بۆنی دەكەیت، بەڵام ئاسنگەرەكە یان پریشكی كورەكەی جلەكانت دەسوتێنێت، یان بۆنی ناخۆش دەبینیت و هەڵیدەمژیت.

**٦ ـ بێ دەنگ بوونی زانایان بە رامبەر بیدعەو شاردنەوەی عیلم:** بێ دەنگ بوونی زانایان بە رامبەر كردنی بیدعەو شاردنەوەی ئەو عیلم و زانیارییەی كەلایانە یەكێكە لە هۆكارەكانی سەرهەڵدانی بیدعەو خراپەكاری لە ناو خەڵكیدا، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلْهُدَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا

---

[٨١] متفق عليه من حديث أبي موسى الأشعري ﷺ : البخاري، كتاب الذبائح والصيد، باب السمك، ٢٨٧/٦، برقم ٥٥٣٤، ومسلم، في كتاب البر والصلة، باب استحباب مجالسة الصالحين، ومجانبة قرناء السوء، ٢٠٢٦/٤، برقم ٢٦٢٨.

بَيَّنَّـٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلْكِتَـٰبِ أُوْلَـٰٓئِكَ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّـٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ وَبَيَّنُوا۟ فَأُوْلَـٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٠﴾ ﴾ (البقرة: ١٥٩-١٦٠) .

واتە: بەڕاستی ئەو کەسانەی کە بەرنامەو ڕێنمونیەکانی ئاشکرای ئێمە دەشارنەوە کە ناردوومانە، دوای ئەوەی کە بۆ خەڵکیمان ڕوون کردۆتەوە لە قورئانی پیرۆزدا، ئا ئەوانە خوای پەروەردگار لە ڕەحم و بەزەیی خۆی دووریان دەخاتەوەو بە نەفرەتیان دەکات، وە فریشتەکان و هەموو خەڵکیش بە نەفرەتیان دەکەن، جگە لەوانەی کە تەوبەیان کردووەو ئەو حەقیقەت و ڕاستیانەیان ڕوون کردۆتەوە کە جاران شاردبویانەوە، ئا ئەوانە تەوبەو گەڕانەوەیان لێ وەردەگرم، وە بەڕاستی تەنها من زۆر تەوبە وەردەگرم و وەزۆر بەبەزەیی و بە ڕەحمم.

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَيَشْتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۙ أُوْلَـٰٓئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ إِلَّا ٱلنَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٤﴾ ﴾ (البقرة: ١٧٤) .

واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە وەحی(سروش) خوای پەروەردگار دەشارنەوە کە لە کتێبەکاندا دایبەزاندووە (تەورات و ئینجیل و قورئان) بەو شاردنەوەیە نرخێکی کەم بە دەست دێنن (ئایەتەکانی خوای پەروەردگار دەفرۆشن بە نرخێکی زۆر کەمی دونیا لە بەر بەرژەوەندی خۆیان، ئەو کەسانە ئەگەر هەموو دونیاشیان دەست بکەوێت هێشتا هەر کەمە بەرامبەر ئەو کارەیان) ئا ئەوانە تەنها ئاگر دەخۆن و سکیانی لێ پڕ دەکەن، وە لە ڕۆژی قیامەتدا خوای پەروەردگار قسەی بەزەیی و بەڕەحمیان لەگەڵدا ناکات، وە پاکیان ناکاتەوە لەو تاوان و خراپەکارییەی کە کردبویان لە دونیادا (تا سزایان نەدات ئەگەر کەسانێکی بێباوەڕ نەبن، خۆ ئەگەر بێباوەڕ ببن بەو کارە ئەوە بە هیچ

شێوەیەك لەو تاوانە پاك نابنەوەو لە دۆزەخیشدا دەرناچن) وە سزای زۆر توندوو بە ئێشیان بۆ هەیە.

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُ فَنَبَذُوهُ وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ وَاشْتَرَوْا بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًا فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ﴾ (آل عمران: ١٨٧).

واتە: خوای پەروەردگار پەیمانی لەو کەسانە وەرگرتووە کە کیتابی بۆ دابەزاندوون تا ڕوونی بکەنە بۆ خەڵکی و مەبەستەکانی باس بکەن و نەیشارنەوە، بەڵام گوێیان پێنەداو خستیانە پشتیانەو بە نرخێکی هەرزان فرۆشتیان، ئای چەند کارێکی خراپیان کردووە؟ ئایەتەکانی خوای پەروەردگاریان فرۆشتووە بەماڵێکی کەمی دونیا.

بۆیە خوای پەروەردگار بە واجب و پێویستی داناوە لەسەر کۆمەڵێك لە موسڵمانان کە بانگەواز بکەن و فەرمان بکەن بە چاکەو ڕێگری بکەن لە خراپە، هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾ (آل عمران: ١٠٤).

واتە: پێویستە لەسەر ئێوەی موسڵمان کە کۆمەڵێکتان تیابێت بانگەواز بکەن بۆ خێرو چاکە، فەرمان بکەن بە کردنی هەموو خێرو چاکەیەك، وە ڕێگری بکەن لە هەموو تاوان و خراپەیەك، بەڕاستی ئا ئەوانە سەرکەوتوو و سەرفرازن.

أبوسعيد الخدري (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) فەرمودەیەکمان بۆ دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی: ((مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الْإِيمَانِ))[٨٢].

[٨٢] رواه مسلم، كتاب الإيمان، باب بيان كون النهي عن المنكر من الإيمان وأن الإيمان يزيد وينقص وأن الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر واجبان، ٦٩/١، برقم ٤٩.

واته: هەر یەکێك لە ئێوە ئەی موسڵمانان خراپەو تاوانکاریەکی بینی با بیگۆڕێت بە هێزو دەسەڵاتی، ئەگەر ئەو موسڵمانە نەی توانی ئەو تاوان و خراپەیە بەدەستەکانی بگۆڕێت ئەوە با بەدەمی بیگۆڕێت (بە ئامۆژگاری، یان بە توڕە بوون)، خۆ ئەگەر نەیتوانی بە زمانیش ئەو تاوان و خراپەیە بگوڕێت ئەوە با بەدڵ بیگۆڕێت (بە دڵ پێی ناخۆش بێت) ئەوەش نیشانەی بوونی لاوازترین ئیمانە لەو کەسەدا.

ئەم فەرمووده پیرۆزە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە بانگەواز کردن بۆ کردنی کاری چاکە و ڕێگری کردن لە تاوان و کاری خراپە پێویستە لە سەر هەموو موسڵمانێك بە پێی تواناو زانیارییەکەی.

عبدالله کوڕی مسعود (ﷺ) دەفەرمویێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((مَا مِنْ نَبِيٍّ بَعَثَهُ اللَّهُ فِي أُمَّتِهِ قَبْلِي إِلَّا كَانَ لَهُ مِنْ أُمَّتِهِ حَوَارِيُّونَ وَأَصْحَابٌ يَأْخُذُونَ بِسُنَّتِهِ وَيَقْتَدُونَ بِأَمْرِهِ. ثُمَّ إِنَّهَا تَخْلُفُ مِنْ بَعْدِهِمْ خُلُوفٌ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ، وَيَفْعَلُونَ مَا لَا يُؤْمَرُونَ. فَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِيَدِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ. وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِلِسَانِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ. وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِقَلْبِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ. لَيْسَ وَرَاءَ ذَلِكَ مِنْ الْإِيمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ))[٨٣].

واتە: هیچ پێغەمبەرێك (ﷺ) نەبووە کە خوای پەروەردگار پێش من ناردبێتی ئیللا کۆمەڵێ هاوەڵ و دۆست و سەرخەری هەبووە، ئەوانە شوێنی سوننەتەکانی دەکەوتن و بە فەرمانی کاریان دەکرد، بەڵام دوای ئەوان کۆمەڵێك هاتن ئەوەی کە دەیڵێن خۆیان نایکەن، وە چەند کارێك دەکەن کە فەرمانیان پێ نەکراوە بیکەن، بۆیە هەرکەسێك بەدەستی جیهادیان بکات ئەوە ئیماندارە، وە هەرکەسێك بەزمانی جیهادیان بکات ئەوە ئیماندارە، وە هەرکەسێك بەدڵی جیهادیان بکات ئەوە ئیماندارە، وە لە دوای ئەم سێ قۆناغەوە بە ئەندازەی دەنکە خەرتەلەیەك ئیمان نییە.

---

[٨٣] رواه مسلم، كتاب الإيمان، باب كون النهي عن المنكر من الإيمان، ١ / ٧٠، برقم ٥٠.

أبوهريرة (ﷺ) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((مَنْ سُئِلَ عَنْ عِلْمٍ يَعلمُهُ فَكَتَمَهُ أُلجِمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِلِجَامٍ مِنْ نَارٍ))[٨٤].

**واتە: هەركەسێك پرسیاری دەربارەی زانستێكی شەرعی لێ بكرێت لە كاتێكدا دەیزانێت بەڵام شاردێوەو بۆی ڕوون نەكردەوە، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا لغاو دەكرێت بە لغاوی ئاگرین.**

**٧ ـ خۆ شوبهاندن بە بێباوەڕان و لاسایی كردنەوەیان: گەورەترین هۆكار بۆ كردن و بڵاو بوونەوەی بیدعە لە نێوان موسڵماناندا بریتییە لە خۆ شوبهاندن بە بێباوەڕان و لاسایی كردنەوەیان، ئەوەی بەڵگە بێت لەسەر ئەم خاڵە ئەو فەرمودەیەیە كە** أبي واقد الليثي (ﷺ) **لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەیگێڕێتەوە، كە دەفەرموێت:** ((خَرَجنا مَعَ رَسولِ اللهِ ﷺ إلى حُنَين، وَنَحنُ حَديثو عَهدٍ بِكُفرٍ، وَكانُوا أسلَمُوا يَومَ الفَتحِ، قالَ: فَمَرَرنا بِشَجَرَةٍ فَقُلنا يا رَسولَ اللهِ ﷺ ، اجعَل لَنا ذاتَ أنواطٍ كما لَهُم ذاتُ أنواط؟ وَكان لِلكُفّارِ سِدرَةٌ يَعكُفُونَ حَولَها، وَيُعَلِّقونَ بِها أسلِحَتَهُم يَدعُونَها ذات أنواطٍ، فَلَمّا قُلنا ذلكَ لِلنَّبيِّ ﷺ قالَ: اللهُ أكبَرُ، قُلتُم وَالذي نَفسِي بِيَدِهِ كَما قَالَت بَنُو إسرائيلَ لِمُوسى: ٱجْعَل لَّنَآ إِلَٰهًا كَمَا لَهُمْ ءَالِهَةٌ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴿١٣٨﴾ الأعراف: ١٣٨) لَتَركَبُنَّ سَنَنَ مَن كانَ قَبلَكُم))[٨٥].

**(أبو واقد) دەفەرمووێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەرچوین بۆ غەزای حونەین، لە كاتێكدە كە ئێمە نزیك بووین لە بێباوەڕییەوە، چونكە**

---

[٨٤] الترمذي، في كتاب العلم، باب ما جاء في كتمان العلم، ٢٩/٥، برقم ٢٦٤٩، وأبو داود، في العلم، باب كراهية منع العلم، ٣٢١/٣، برقم ٣٦٥٨، وابن ماجه، في المقدمة، باب من سئل عن علم فكتمه، ٩٨/١، برقم ٢٦٦، ومسند أحمد، ٢٦٣/٢، ٣٠٥، وصححه الألباني في صحيح سنن الترمذي، ٣٣٦/٢، وصحيح سنن ابن ماجه، ٤٩/١.

[٨٥] أخرجه بلفظه، أبو عاصم في كتاب السنة، ٣٧/١، برقم ٧٦، وحسن إسناده الألباني في ظلال الجنة في تخريج السنة، المطبوع مع كتاب السنة، ٣٧/١، وأخرجه الترمذي بنحوه، في كتاب الفتن، باب ما جاء لتركبن سنن من كان قبلكم، ٤٧٥/٤، برقم ٢١٨٠، وقال: هذا حديث حسن صحيح، وانظر: النهج السديد في تخريج أحاديث تيسير العزيز الحميد، لجاسم بن فهيد الدوسري، ص٦٤–٦٥.

هەندێکمان تازە موسڵمان ببووین پێش فەتحی شاری مەککە، ئەبی واقد دەفەرمووێت: تێپەڕیتین بە تەنیشت دارێکدا ووتمان: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) تۆش دارێکمان بۆ دیاری بکە تا شمشێرو تیرو ڕمەکانمانی پێ هەڵواسین هەروەك چۆن هاوەڵ بڕیاردەران دارێکیان داناوە شمشێرو تیرو ڕمەکانیانی پێوە هەڵدەواسن باوەڕیان وایە پیرۆزەو سەریان دەخات (هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) هەندێکیان وایان ووت باوەڕیان وابوو ئەگەر ئەو کارە بکەن ئەوە سەر دەکەون)، موشریکەکان دارێکیان هەبوو لە دەوری دەمانەوەو بە دەوریدا دەسوڕانەوە و شمشێرو تیرو ڕمەکانیان پێوە هەڵدەواسی پێیان دەوت: (ذات أنواط)، أبي واقد دەفەرمووێت: کاتێك ئەو شتەمان بە پێغەمبەر (ﷺ) ووت، زۆر تووڕە بوو و فەرمووی: "الله أكبر" واتە: خوا لە هەموو کەس و شتێك گەورەترە، سوێند بەو خوایەی کە گیانی منی بە دەستە شتێکتان ووت، هەر چۆن (بنو إسرائيل) شوێن کەوتوانی پێغەمبەر موسی (عليه السلام) بە موسایان (عليه السلام) ووت: ﴿ٱجْعَل لَّنَآ إِلَـٰهًا كَمَا لَهُمْ ءَالِهَةٌ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ﴾ ئەی موسی (عليه السلام) پەرستراوێکمان بۆ دابنێ هەرچۆن ئەوان (موشریکان) پەرستراویان هەیە، موسی (عليه السلام) فەرمووی: بەڕاستی ئێوە گەلێکی نەزانن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەڕاستی ئێوە شوێنی مەنهەج و ڕێبازی پێش خۆتان دەکەون (واتە: شوێنی گاورو جولەکە دەکەون).

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر ئەوەی کە خۆ لێکچواندن و شوێن کەوتنی موشریکان وای لە گەلەکەی پێغەمبەر موسی (عليه السلام) کرد تا داوای ئەو کارە خراپەی لێ بکەن، وە هەر ئەوەش بوو وای لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) کرد تا داوای لێ بکەن دارێکیان بۆ دابنێت و ئەوانیش بە پیرۆزو گەورەی بزانن جگە لە خوای پەروەردگار، کە زۆر بەداخەوە زۆربەی موسڵمانانی ئەمڕۆ بەو شێوەیەن کە شوێنی کافران کەوتوون و لاساییان

دەكەنەوە لە زۆربەی كارە بیدعەو تازە داهێنراو شیركیەكاندا وەكو: جەژنەكانی لە دایك بوون و بیدعەو تازە داهێنراوەكانی مردوو، وە خانوو دروست كردن لە سەر گۆڕەكان، موسڵمانی خۆشەویست ئەوەی كە گومانی تیا نییە شوێن كەوتنی ڕێگاو مەنهەجی گاورو جولەكەو بێباوەڕان دەرگایەكە لە دەرگاكانی هەواو ئارەزوو[٨٦].

ئەوەی زیاتر ئەم باسەمان بۆ ڕوون بكاتەوە ئەو فەرمودەیەیە كە أبو سعيد الخدري بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) كە فەرمویەتی: ((لَتَتَّبِعُنَّ سَنَنَ من كان قبلكم: شبراً بشبرٍ، وذراعاً بدراعٍ، حتى لو دخلوا في جحر ضبٍّ لاتبعتموهم، قلنا: يا رسول الله، اليهود والنصارى؟ قالَ: فَمَن))[٨٧].

واتە: ئێوە ئەی موسڵمانان شوێنی گەلانی پێش خۆتان دەكەون: بست بە بست و باڵ بە باڵ، هەتا ئەوان بچنە ناو كونی بزن مژۆكەوە ئێوەش دەچنە ناویەوەو شوێنیان دەكەون، ووتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مەبەستت گاورو جولەكەیە كە ئێمە شوێنیان دەكەوین، فەرموی: بەڵێ ئەی كێی تر هەیە.

زانای پایە بەرز ئیمامی النووي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: السُّنَن: ڕێگایە، مەبەست بە: (الشّبر، والذّراع، وجحر الضّب) : نموونە هێنانەوەیە بەوەی كە موسڵمانان زۆر بە خێرایی شوێنیان دەكەون لەسەر پێچی و تاواندا، نەك لە بێباوەڕیدا، بەڕاستی لەم فەرموودەیەدا موعجیزەیەكی ڕوون و ئاشكرای

---

[٨٦] بڕوانە: تنبيه أولي الأبصار إلى كمال الدين وما في البدع من أخطار، للدكتور صالح السحيمي، ص١٤٧، ورسائل ودراسات في الأهواء والافتراق والبدع وموقف السلف منها، للدكتور ناصر العقل، ١٧٠/٢، وكتاب التوحيد، للدكتور العلامة صالح الفوزان ص٨٧.

[٨٧] متفق عليه: البخاري، كتاب الاعتصام بالكتاب والسنة، باب قول النبي ﷺ: "لتتبعن سنن من كان قبلكم"، ١٩١/٨، برقم ٧٣٢٠، ومسلم، كتاب العلم، باب اتباع سنن اليهود والنصارى، ٢٠٥٤/٤، برقم ٢٦٦٩.

تێدایە سەبارەت بەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پێداوە کە بەڕاستی لە ناو موسڵمانانیدا ڕوویداوە.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە بست بە بست و باڵ بە باڵ، هەتا ئەوان بچنە ناو کونی بزن مژۆکەوە ئێوەش دەچنە ناویەوەو شوێنیان دەکەون، هێنانەوەی نمونەیەکی بەرچاوە لەسەر ئەوەی کە موسڵمانان هەندێکیان شوێنی گاورو جولەکە دەکەون لە هەموو ئەو کارانەی کە نەهیان لێ کراوە، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) ئاگاداری کردوینەتەوە لەوەی کە خۆمان لێك نەچوێنین بە کەسانی جگە لە موسڵمانان، هەروەك دەفەرموێت: ((بُعِثْتُ بِالسَّيْفِ بَيْنَ يَدَيْ السَّاعَةِ حَتَّى يُعْبَدَ اللَّهُ وَحْدَه لَا شَرِيكَ لَهُ، وَجُعِلَ رِزْقِي تَحْتَ ظِلِّ رُمْحِي. وَجُعِلَ الذِّلَّة وَالصَّغَار عَلَى مَنْ خَالَفَ أَمْرِي. وَمَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ))[88].

واتە: من نێردراوم وەکو پێغەمبەرێك (ﷺ) لەبەر دەستی قیامەتدا بە شمشێر (جیهاد بکەم لە گەڵ بێباوەڕاندا) هەتا خوای پەروەردگار بەتاك و تەنها بپەرسترێت و بە هیچ شێوەیەك هاوەڵی بۆ بڕیارنەدرێت (واتە: تێبکۆشم لەگەڵ موشریکاندا تا واز لە دارو بەردو بت پەرستی بهێنن و تەنها خوای پەروەردگار بە تاك و تەنها بپەرستن)، وە ڕزقم لە ژێر سێبەری ڕمەکەمدایە (واتە: کاتێ غەزا دەکەم ئەوماڵەی بێباوەڕان دەکەوێتەژێر دەستم حەڵاڵە بۆم)، وە سەرشۆڕی و بچوکی بۆ ئەو کەسەیە کە بە پێچەوانەی فەرمانەکانی من دەجولێتەوە، وە هەر موسڵمانێك خۆی لێك بچوێنێت بە گەلێك جگە لە موسڵمانان ئەوە وەکو ئەوان وایە و لەوانە.

٨ ـ **پشت بەستن بە فەرموودە لاوازو هەڵبەستراوەکان**: یەکێك لەو هۆکارانەی کەسەر دەکێشێت بۆ کردنی بیدعەو بڵاو بوونەوەی پشت بەستن بە فەرموودە

---

[88] أحمد في المسند، ٢/٥٠، ٩٢، وصحح إسناده أحمد محمد شاكر في شرحه للمسند برقم ٥١١٤، ٥١١٥، ٥٦٦٧، من حديث ابن عمر (رضي الله عنهما).

لاوازو هەڵبەستراوەكان، زۆربەی هەرەزۆری كەسانی بیدعەچی پشت دەبەستن بەو فەرمودە لاوازو بێهێزو درۆیانەی كەهەڵبەستراون بەدەم پێغەمبەری خواو (ﷺ)، ئەو فەرموودانەی كە زانایانی فەرمودەناس و شارەزا لە بواری گێڕانەوەی فەرمودەدا پشتیان پێ نابەستن، بەڵام ئەهلی بیدەع ئەو فەرموودە ڕاست و دروست و صەحیحانە ڕەت دەكەنەوەو وەری ناگرن ئەگەر پێچەوانەی ئەو بیرو بۆ چوون و بیدعەیە بێت كەلەسەرین، هەر بۆیە بەو هۆیەوە بە هیلاك چوون و خەسارەو مەند بوون، ولا حول ولا قوة إلا بالله.

٩ - **زیادەڕەوی كردن لە پلەو پایەی پێغەمبەران** (علیهم الصلاة والسّلام) **و پیاوچاكاندا:** بەڕاستی گەورەترین هۆكارە بۆ دەركەوتن و پەرەسەندنی بیدعە، بەڕاستی هۆكاری شەریك بڕیاردان بۆ خوای پەروەردگار هەمووی لەم ڕێگایەوە بووە، چونكە خەڵكی لە دوای پێغەمبەر ئادەم (عليه السلام) تا دە سەدە لەسەر بیرو باوەڕێكی پاك و خوا بە تەنها پەرستی بوون، بەڵام دوای ئەو ماوەیە خەڵكی دڵیان پەیوەست كرد بە پیاو چاكانەوە (لە ڕووی هاوار بۆ كردن، باوەڕ بوون بەوەی كە پیاو چاكان دوای مردنیان سودو زیانیان بەدەستە وە دەتوانن شیفای نەخۆش بدەن....)، وە زیادە ڕەویان تیا كردن تا وای لێ هات پەرستیانیان جگە لە خوای پەروەردگار .

بۆیە خوای پەروەردگار پێغەمبەر نوحی (عليه السلام) نارد تا خەڵكی بانگ بكات بۆ پەرستنی خوای پەروەردگار بە تاك و تەنها و واز هێنان لە پەرستنی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسّلام) و پیاوچاكان و دارو بەردەكان، بۆیە پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسّلام) كاتێك خوای پەروەردگار ناردیانی بەهەمان شێوە ئەو بانگەوازەیان كرد[٨٩] ، وە زیادەڕەوی كردن لە پیاوچاكان جاری

[٨٩] بڕوانە: البداية والنهاية، لابن كثير، ١ ٦٠١.

واهەیـە دەبێتـە شـیرك وەكـو: زیـاد ڕێـز گـرتن لـە پێشەواو پیاوچـاكان و بـەرز كردنەوەیان زیاد لە پلەو پایەی خۆیان تا وای لێدێت لە كۆتاییدا دەپەرسترێن، وە زیادەڕەوی جاری واهەیە لە دیندا دەكرێت: ئەویش بە زیـادەڕەوی كـردن لـەو شەرعەی كە خوای پەروەردگار دایناوە، یان زۆر تونـد بـوون لـە جێبەجێكردنی شەرعدا، یان كافر كردنی موسڵمانێك بە ناحەق، زیادەڕەوی لـە ڕاستیدا بریتیـە لە: دەرچوون وبەزاندنی سنور لە بیروباوەڕو كردەوەكاندا، ئـەویش بـە دەربڕینـی سوپاسێكی زیاد بۆ شتێك ، یان زۆر سەرزەنشت كردنـی شـتێك بـەو پێیـەی كـە شایستەیەتی[٩٠] ، بۆیە خوای پەروەردگار ئاگاداری كردوینەتەوە كە زیـادەڕەوی نەكەین هەتا لە عیبادەت و پەرستنیشدا، هەروەك پەروەردگار بە ئـەهلی كیتـابی فەرمووە: ﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ ﴾ (النساء: ١٧١) .

واتە: ئەی ئەهلی كیتاب (مەبەست پێیان گاورەكانن) زیادەڕەوی مەكەن لـە دینەكەتانـدا (ووتەیـەك، كردەوەیـەك زیـاد مەكـەن لەدینەكەتانـدا كـە خـوای پەروەردگار فەرمانی پێنەكردوون تا بیكەن).

وە هـەروەها پێغەمبـەر (ﷺ) ئاگـاداری كردوینەتـەوە كـە زیـادەڕەوی نەكەین، هـەروەك إبن عبـاس (رضـي الله عنـهما) لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) بۆمـان دەگێڕێتەوە كە فەرمویـەتی: ((إِيَّاكُـمْ وَالْغُلُوَّ فِي الـدِّينِ فَإِنَّمَا أَهْلَكَ مَـنْ كَـانَ قَبْلَكُمْ الْـغُلُوُّ فِي الدِّينِ))[٩١].

[٩٠] بڕوانە: إقتضاء الصراط المستقيم، لإبن تيمية، ١/٢٨٩.

[٩١] النسائي، كتاب المناسك، باب التقاط الحصى ٥/٢٦٨، وابن ماجه، كتاب المناسك، باب قدر حصى الرمي ٢/١٠٠٨، وأحمد ١/٣٤٧، وصحح إسناده شيخ الإسلام ابن تيمية في اقتضاء الصراط المستقيم ١/٢٨٩.

واتە: ئاگادارتان ئەكەمەوەو ئەتان ترسێنم لە زیادەڕەوی كردن و ڕۆچون لە دیندا بە شێوەیەكی ناشەرعی، چونكە قەومانی پێش ئێوە لەناو چوون بە زیادەڕەوی كردن و ڕۆچون لە دیندا بە شێوەیەكی ناشەرعی و نادروست.

لەم فەرمودەیەدا ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت كە زیادەڕەوی كردن لە دیندا گەورەترین هۆكارە بۆ شەریك بڕیاردان بۆ خوای پەروەردگار و كردنی بیدعەو شوێن كەوتنی هەواو ئارەزوو[٩٢]، هەر لەبەر ترسناكی زیادەڕەوی كردنە لە دیندا كە پێغەمبەر (ﷺ) ئاگاداری كردوینەتەوە تا زیاد لە سنور دەرنەچین و زیادەڕەو نەبین لە پیاهەڵدان بە پلەو پایەی هیچ كەسێكدا، هەروەك فەرموویەتی: ((لَا تُطْرُونِي كَمَا أَطْرَتِ النَّصَارَى ابْنَ مَرْيَمَ، فَإِنَّمَا أَنَا عَبْدُهُ، فَقُولُوا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ))[٩٣].

واتە: زیاد بەشان و شەوكەتمدا هەڵمەدەن و لە سنوری بەندایەتیەوە دەرم مەكەن بۆ سنوری خوایەتی و پەرستراوێتی، هەروەك چۆن گاورەكان زیادەڕەویان كرد لە (عیسای كوڕی مریم) (عليه السلام) هەندێكیان ئەوەندە زیادەڕەویان كرد تیایدا ووتیان خوایە، هەندێكیان ئەڵێن كوڕی خوایە وە بۆچونی تریشیان هەیە تێیدا، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: من تەنها بەندەی خوام، بۆیە دەربارەی من بڵێن و باوەڕتان وابێت كە بەندەو پێغەمبەری خوام (ﷺ).

---

[٩٢] بڕوانە: اقتضاء الصراط المستقيم، لابن تيمية، ١/ ٢٨٩، والاعتصام للشاطبي، ١/ ٣٢٩-٣٣١، ورسائل ودراسات في الأهواء والبدع وموقف السلف منها، للدكتور ناصر العقل، ١/ ١٧١، ١٨٣، والغلو في الدين في حياة المسلمين المعاصرة، للدكتور عبد الرحمن ابن معلا اللويحق، ص٧٧-٨١، والحكمة في الدعوة إلى الله عز وجل، لسعيد بن علي [الكاتب]، ص٣٧٥.

[٩٣] البخاري، كتاب الأنبياء، باب قول الله تعالى: {واذكر في الكتاب مريم ...}، ٤/ ١٧١، برقم ٣٤٤٥

موسـڵمانی خۆشەویست پێغەمبەری خـوا (ﷺ) بەرامبـەر بـە خـوای پەروەردگار تەنها بەندەو مرۆڤێکە وەکو سەرجەم مرۆڤەکانی تر، بەڵام بەرامبەر بە ئێمە پێغەمبەرێکی (ﷺ) ڕەوانە کراوە لـە لایـەن خـوای پـەروەردگارەوە کـە باوەڕ پێبوون و شوێنکەوتن و گوێڕایـەڵی کردنـی و پـێش خستنی فەرمانـەکانی بەسەر فەرمانی مرۆڤەکاندا پێویست و واجبە و نیشانەی باوەڕداری و گوێڕایـەڵی کردنتە بۆی، وە باوەڕ پێنەبون و شوێن نەکەوتن و گوێڕایـەڵی نـەکردن و پـێش خستنی فەرمانی مرۆڤەکانی تر بەسەریدا نیشانەی بێ باوەڕی و ئیمان لاوازییـە، بۆیە خۆشەویستی پێغەمبـەر (ﷺ) بـەدەم نابێـت بـەڵکو بـە زیندووکردنـەوەی سوننەت و ڕێبازەکەیەتی .

## ۞ باسی پێنجەم: بەشەکانی بیدعە

بیدعە چەند بەشێکی جۆراو جۆری هەیە، فەرموو تۆو ڕوون کردنـەوەی ئـەو بەشانە بە شێوەیەکی کورت و پوخت:

***بەشی یەکەم: بیدعەی حەقیقی و بنەڕەتی و بیدعەی زیاد کراو:***

١ ـ **بیدعەی حەقیقی و بنەڕەتی** (البدعة الحقيقية والأصية) : ئـەویش بریتیـە لـەو بیدعەیەی کە نە لە قورئانی پـیرۆز و نـە لـە سوننەتی پێغەمبەرو (ﷺ) نـە لـە ووتەی یەکدەنگی زانایاندا بەڵگەی لەسەر نییە، نە بـە شـێوەیەکی گشتی وە نـە بە شێوەیەکی تفصیلی، هـەر بۆیـە ئـەم کـارە نـاو نـراوە بیدعـە لـە بـەر ئـەوەی شتێکی تازە داهێنراوە لە دیندا بێئەوەی لە پێشدا بوونی هەبوو بێت[٩٤].

نموونە لە سەر ئەم جۆرە بیدعەیە، وەکو: عیبادەت کردن و نزیك بوونـەوە لە خـوای پـەروەردگار بـە دوور کەوتنـەوە لـە خـەڵك و (موسـڵمانان) چـوونە نـاو ئەشکەتوو شاخەکان و وازهێنان لە هەموو خۆشیەکانی دونیا بە گومـانی ئـەوەی

---

[٩٤] بڕوانە: الإعتصام للشاطبي، ١/٣٦٧

ئەم کارانە نزیك بوونەوەیە لە خوای پەروەردگار، ئەوانەی ئەم کارانە دەکەن پەرستن و عیبادەتێکیان داهێناوە لە لایەن خۆیانەوە، وە خۆیان پێوە پەیوەست کردووە بۆئەوەی خوای پەروەردگار سەرمانی پێ‌بردبێتن [٩٥] ، وە هەروەها نمونەیەکی تر لە سەر ئەم جۆرە بیدعەیە، وەکو: حەرام کردنی ئەو شتانەی کە خوای پەروەردگار حەڵاڵی کردووە گوایە وازیان لێبهێنرێت عیبادەت و پەرستنە بۆ خوای پەروەردگار [٩٦] ، وە جگە لەم نمونانەش، بۆ زیاتر شارزابوون بڕوانە [٩٧].

٢ ـ **بیدعەی زیاد کراو** (البدعة الإضافية) : ئەم بیدعەو زیادەکراوە دوو ڕوو یان دوو بەشی هەیە:

**یەکەم**: کردنی ئەم بیدعەیە بەڵگەی لەسەرە بۆیە لەم ڕووەوە نابێتە بیدعە.

**دووەم**: کردنی ئەم بیدعەیە هیچ پەیوەندی نییە بە بەڵگەکەوە (بەڵکو وەکو بیدعەی حەقیقی و بنەڕەتی) وایە، واتە: لە ڕوویەکەوە سوننەتە لەبەر ئەوەی بەڵگەی لەسەرە، بەڵام لە ڕوویەکی ترەوە دەبێتە بیدعە لەبەر ئەوەی وەستاوە لەسەر شوبهە نەك بەڵگە، وە جیاوازی نێوانیان لە ڕووی واتاوە ئەوەیە: یەکەم لە بنەڕەتدا بەڵگەی لەسەرە، بەڵام لە ڕووی چۆنیەتی و حاڵەتەکانیەوە بەڵگەی لەسەر نییە (لە کاتێکدا پێویستی بەبەڵگە هەیە بۆ ئەوەی بکرێت) ئەم بیدعەیە زیاتر لە عیبادەت و پەرستەکاندا ڕوو دەدات نەك لە عادات و داب و نەریتەکاندا [٩٨]

---

[٩٥] **بڕوانە**. الإعتصام للشاطبي ١/٣٧٠، وتفسير القرآن العظيم، لابن كثير، ٤/٣١٦، وتيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان، للسعدي، ص ٧٨٢.

[٩٦] **بڕوانە**. الإعتصام للشاطبي، ١/٤١٧.

[٩٧] **بڕوانە: هەمان سەرچاوە**، ١/٣٧٠-٤٤٥.

[٩٨] **بڕوانە: هەمان سەرچاوە**، ١/٣٧٠-٤٤٥

نموونه لەسەر ئەم جۆرە بیدعەیە: زیکرەکانی دوای نوێژە فەرزەکان، یان کردنی زیکر لەهەر کاتێکدا بە شێوەی کۆڕو کۆبونەوە، یان ئیمام بە دەنگی بەرز دوعا بکات و نوێژ خوێنانیش بڵێن: آمین، زیکر و یادکرنی خوای پەروەردگار کارێکی سوننەت و زۆر خێرە، بەڵام کردنی بەو شێوەیە خێر نییە، بەڵکو بیدعەیەو پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە (ﷺ)[٩٩] ، وە لەو بیدعانە تایبەت کردنی پانزەی مانگی شعبان بە گرتنی ڕۆژوو، وە تایبەت کردنی شەوەکەی بە شەو نوێژ کردن، وە کردنی نوێژی (الرّغائِب) لە جومعەی یەکەمی مانگی ڕەجەبدا، ئەم کارانە بیدعەیەکی خراپن، وە بیدعەیەکی زیادکراون، لە بەر ئەوەی نوێژ کردن و ڕۆژوو گرتن بنەڕەت تیایاندا شەرعییەو کارێکی زۆر زۆر چاك و خێرە، بەڵام ئەنجامدان و تایبەت کردنی بە کاتێکی دیاری کراو، یان تایبەت کردنی بە شوێنێکی دیاری کراو، یان تایبەت کردنی بە شێوەیەکی دیاری کراو دەبێتە بیدعە، چونکە نەبەڵگەی قورئانی پیرۆزو نە سوننەتی پێغەمبەری (ﷺ) لەسەر نییە، بۆیە ئەم کارانە لە بنەڕەت و خودی خۆیاندا کارێکی شەرعی و خێرن، بەڵام بیدعەن بەو پێیەی کە بەو شێوەیە دەکرێت[١٠٠].

---

[٩٩] بڕوانە: الاعتصام للشاطبي ١/٤٥٢، وتنبيه أولي الأبصار إلى كمال الدين وما في البدع من أخطار، للدكتور صالح السحيمي، ص ٩٦.

[١٠٠] بڕوانە: أصول في البدع والسنن، للشيخ العدوي، ص٣٠، وتنبيه أولي الأبصار إلى كمال الدين وما في البدع من أخطار، للسحيمي، ص٩٦.

### ۞ بەشی دووەم: بیدعە لە ڕووی كردن و واز لیّ هیّنانەوە

١ ـ **بیدعە لە ڕووی كردنەوە:** دەچیّتە ژیّر پیّناسەی بیدعەوە كە بریتیە لە: (البدعة: طَرِيقَةٌ فِي الدِّينِ مُخْتَرَعَة،تُضاهِي الشَّرعِيَّة، يُقصَدُ بِالسُّلوكِ عَلَيهَا الْمُبالَغَةُ فِي التَّعَبُّدِ للهِ سُبحانَه)[101].

واتە : بیدعە: ئەو ڕیّگا تازە داهیّنراوەیە كە ئەگەر ببینیت و سەیری بكەیت لە كاریّكی دروست و شەرعی دەچیّت (كە لە بنەڕەتیشدا وانییە) مەبەست بە كردن و ئەنجامدانی ئەو كارە زیاد عیبادەت كردنە بۆ خوای پەروەردگار.

نمونە لەسەر ئەم جۆرە: زیادكرنی ووتەیەك یان كاریّك كە خۆی لە شەرعی خوای پەروەردگاردا نەبیّت، وەكو: كەسیّك ڕكاتیّك زیاد بكات لە نویّژدا، یان شتیّك بیّنیّتە ناو دینەوە كە خۆی ئەو شتەی تیّدا نەبیّت، یان عیبادەتیّك بكات بە پیّچەوانەی سوننەت و هەڵس و كەوت و ڕەوشتی پیّغەمبەر (ﷺ) بیّت، یان كاتیّك تایبەت بكات بە عیبادەتیّكی شەرعی لە كاتیّكدا خوای پەروەردگار و پیّغەمبەر (ﷺ) تایبەتیان نەكردووە، وەك تایبەت كردنی پانزەی مانگی شعبان بە گرتنی ڕۆژوو وە تایبەت كردنی شەوەكەی بە شەو نویّژ كردن.

٢ ـ **بیدعەی نەكردن و واز لیّ هیّنان** (البدعة التركية) : ئەم جۆرەش دەچیّتە ژیّر گشتی پیّناسەی بیدعە لەو ڕووەوەی كە (طريقة في الدّين مخترعة) ڕیّگایەكی تازەی داهیّنراوە لە دیندا، جاری واهەیە واز هیّنان و نەكردنی كاریّك دەبیّتە بیدعە جا ئەو كارەی كە وازی لیّ هیّنراوە حەرام بیّت یان نا، بۆ نمونە: جاری واهەیە كاریّك حەڵاڵەو دروستە بكریّت لە شەرعدا، بەڵام كەسیّك لەسەر خۆی حەرامی دەكات، یان بە مەبەستیّك وازی لیّدیّنیّت، ئەو واز لیّ هیّنانە یان ئەوەتا لە شەرعدا بایەخی پیّدراوە، یان نا، ئەگەر ئەو كارە لە شەرعدا بایەخ پیّدراو بوو ئەوە واز لیّ هیّنانی هیچی تیّدا نییە، لە بەر ئەوەی واز هیّنان لە كاریّك كە

---

[101] بڕوانە: الاعتصام لشاطبي ١/٥٠-٥٦.

دروسته نەکرێت یان داوا کراوە کە نەکرێت، ئەوە نەکردن و واز لێ هێنانی هیچی تێدا نییە، وەکو کەسێك خواردنی کەسێك ناخوات لە بەر ئەوەی زیانی هەیە بۆ لاشەی یان عەقڵی یان دینەکەی، یان هەر شتێکی تر، بۆیە لێرەدا هیچ رێگرێك نییە لە واز هێنان لەو شتە حەڵاڵانە، ئەم واز هێنانە دەگەڕێتەوە بۆ خۆ پاراستن لەو شتانەی کە زیانیان تێدایە.

بنچینەی ئەم کارە دەگەڕێتەوە بۆ فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرمویەتی: ((يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ. وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ، فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ))[102].

واتە: ئەی کۆمەڵی گەنجان هەر یەکێك لە ئێوە توانای هەیە ژن بێنێت (توانای لاشەیی وماڵی) با ژن بێنێت، چونکە ژن هێنان پاراستنی چاو و داوێنی تێدایە، وە هەر کەسێك توانای نییە ژن بێنێت با بە ڕۆژوو بێت چونکە ڕۆژوو گرتن قەڵغان و پارێزەرە بۆی لە تاوان.

وە دروستە کەسێك واز لە هەندێ شت بهێنێت کە لە شەرعدا هیچی تیانییە لە ترسی ئەوەی نەکەوێتە کارێکەوە کە شتی تیایە، ئەمە وەکو واز هێنانە لەو کارانەی کە شوبهەیان تیایە لە ترسی کەوتنە ناو حەرامەوە، وە پاك ڕاگرتن و دوور بوونی دین و نەفسیان لە شوبهەکان.

بەڵام ئەگەر کەسێك واز لەو شتانە بێنێت کە لە دیندا حەڵاڵن، ئەگەر نەکردن و واز لێ هێنانەکەی وەکو پیشاندانی دینداری بێت، ئەوە دروست نییەو دەبێتە بیدعە، جا ئەو شتەی کە نایکات حەڵاڵ بێت یان فەرمان پێ کراو بێت، وە یان ئەو شتە لە پەرستن یان کڕین و فرۆشتن یان داب و نەریتەکاندا بێت، جا

[102] متفق عليه من حديث عبد الله بن مسعود ﷺ: البخاري، كتاب الصوم، باب الصوم لمن خاف على نفسه العزبة، ٢/٢٨٠، برقم ١٩٠٥، ومسلم، كتاب النكاح، باب استحباب النكاح لمن تاقت نفسه إليه ووجد مؤنته، ٢/١٠١٨، برقم ١٤٠٠.

ئەو نەکردنە بە ووتە یان بە کردەوە یان بە بیروباوەڕ بێت، ئەو کەسەی کە ئەم شتانە ناکات ئەگەر باوەڕی وابێت بە واز هێنان و نەکردنی ئەو کارانە لە خوای پەروەردگار نزیك دەبێتەوە ئەوە کەسێکی بیدعەچییە بە واز هێنانی لەو کارانە.

بەڵگەشمان لەسەر ئەوەی کە واز هێنان و نەکردنی ئەو شتانە وەکو دین دەبێتە بیدعە، بەسەرهاتی ئەو سێ کەسەیە کە هاتن بۆ یەکێك لە ماڵەکانی پێغەمبەرو (ﷺ) پرسیاریان لە یەکێك لە خێزانەکانی کرد سەبارەت بە عیبادەتی پێغەمبەر (ﷺ) ((فَلَمَّا أُخْبِرُوا بِهَا كَأَنَّهُمْ تَقَالُّوهَا، فَقَالُوا: أَيْنَ نَحْنُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ، وَقَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ؟ فَقَالَ أَحَدُهُمْ: أَمَّا أَنَا فَأُصَلِّي اللَّيْلَ أَبَدًا، وَقَالَ الآخَرُ: أَنَا أَصُومُ الدَّهْرَ فَلا أُفْطِرُ، وَقَالَ الآخَرُ: أَنَا أَعْتَزِلُ النِّسَاءَ وَلا أَتَزَوَّجُ أَبَدًا، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: أَنْتُمُ الَّذِينَ قُلْتُمْ كَذَا وَكَذَا، أَمَا وَاللَّهِ إِنِّي لأَخْشَاكُمْ لِلَّهِ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ، لَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ، وَأَتَزَوَّجُ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي))[١٠٢].

واتە: کاتێك هەواڵیان پێدرا دەربارەی عیبادەتی پێغەمبەر (ﷺ) بە کەمیان زانی، ئەوەبوو وتیان: ئێمە لە کوێ و پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کوێ؟ خوای پەروەردگار لە هەموو تاوانەکانی سەرەتاو کۆتای پێغەمبەر (ﷺ) خۆش بووە، بۆیە یەکێکیان ووتی: من بەردەوام شەونوێژ دەکەم و هەرگیز ناخەوم، دووەمیان ووتی: من ساڵ دوانزەی مانگ بە ڕۆژوو دەبم هەرگیز ڕۆژێکی نابێت بە ڕۆژوو نەبم، سێیەمیان ووتی: من دوور دەکەومەوە لە ژن و هەرگیز ژن ناهێنم، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) هاتەوەو خێزانەکانی ئەو کارەیان بۆ باس کرد چووە سەر مینبەرو فەرموی: ئێوەن ئەو کەسانەی کە ئاوها و ئاوهاتان ووتبوو؟

---

(١٠٢) متفق عليه من حديث أنس بن مالك ﷺ: البخاري، كتاب النكاح، باب الترغيب في النكاح، ١٤٢/٦، برقم ٥٠٦٣، ومسلم، كتاب النكاح، باب استحباب النكاح لمن تاقت نفسه إليه، ١٠٢٠/٢، برقم ١٤٠١.

ئاگادار بن و باش بزانن سوێند بە خوای پەروەردگار من لە هەموتان زیاتر لە خوای پەروەردگار دەترسم لە هەموشتان زیاتر عیبادەتی بۆ دەکەم و خۆم لە سزای دەپارێزم، بەڵام من بە ڕۆژوو دەبم وە ڕۆژی واش هەیە بە ڕۆژوو نابم (ڕۆژووی سوننەت نەك فەرز)، وە شەوان شەونوێژ دەکەم و دەش خەوم، وە ژنیش دێنم، بۆیە ئاگاداربن ئەی موسڵمانان هەر کەسێك واز لە سوننەتی من بێنێت و حەزی لێ نەکات ئەوە لە من نییە (لەو کارەدا).

مەبەست بە (سُنَّتِي) ڕێگەو ڕێبازی من، جگە لە فەرزەکان، وە (مَن رَغِبَ عَن سُنَّتِي) مەبەست پێی: پشت هەڵکردنە لە سوننەتی من و ڕووکردنە شتی تر، بۆیە مەبەست بە فەرمودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەیە: هەر کەسێك واز لە مەنهەج و ڕێبازی من بهێنێت و جگە لە مەنهەج و ڕێبازی من بگرێتەبەر ئەوە لە من نییە (لە ڕێگەو ڕێبازی من لایداوە)[١٠٤].

موسڵمانی خۆشەویست و سوننەت لە دڵا شیرین ئەوەی کەباسکرا ئەوەمان بۆ ڕوون بووەوە، بیدعە دوو بەشە: بیدعەیەك لە ڕووی زیاد کردنەوە، بیدعەیەك لە ڕووی واز لێ هێنان و نەکردنەوە، هەروەك بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە سوننەتیش دوو بەشە: سوننەت لە ڕووی کردنی کارێکەوە، سوننەتێك لە ڕووی واز لێ هێنان و نەکردنەوە، سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) هەرچۆن بە کردنی کارێکی سوننەت دەبێت، بەهەمان شێوە نەکردن و وازلێ هێنانی هەندێ کار خۆی لە خۆیدا سوننەتە، بۆیە خوای پەروەردگار چۆن بە پێویستی داناوە لەسەرمان کە شوێنی پێغەمبەر (ﷺ) بکەوین لەو کارانەی کە نزیکمان دەکاتەوە لە خوای پەروەردگار "ئەگەر لەو کارانە نەبێت کە تەنها تایبەتە بە پێغەمبەر (ﷺ)" بە هەمان شێوە خوای پەروەردگار فەرمانی پێ کردووین و لەسەری پێویست کردووین کە شوێنی بکەوین، ئەویش بە واز هێنان و نەکردنی هەندێ کار، بۆیە

[١٠٤] بڕوانە: فتح الباري، لابن حجر، ٩/١٠٥.

واز هێنان و نەکردنی هەندێ کار خۆی لە خۆیدا دەبێتە سوننەت، وە کردنی هەندێ کار دەبێتە سوننەت، بۆیە موسڵمانی خۆشەویست باش بزانەو ئاگاداربە چۆن ئێمە ناتوانین لە خوای پەروەردگار نزیك ببینەوە بە واز هێنان و نەکردنی ئەو کارە چاکانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) کردویانێتی، بەهەمان شێوە ناتوانین لە خوای پەروەردگار نزیك ببینەوە بە کردنی ئەو کارانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) نەیانی کردووە (کردنی بیدعە)، بۆیە ئەو موسڵمانەی کە شتێك دەکات و پێغەمبەر (ﷺ) نەی کردووە، وەکو ئەو موسڵمانە وایە کە واز لەو شتانە دینێت کە پێغەمبەر (ﷺ) کردوویانێتی، یەکسانن بێ هیچ جیاوازییەك[١٠٥].

**◉ بەشی سێیەم: بیدعەی ووتەیی بیروباوەڕی، وە بیدعەی کرداری**

١ ـ **بیدعەی ووتەیی بیروباوەڕی:** وەکو ووتەو بیروباوەڕی جهمية و معترلة و رافضة و سەرجەم گروپە گومڕاو سەرلێشێواوەکان، وە بیدعەی گروپە تازە دەرکەوتووەکانی وەك (القاديانية، والبهائية)، وە سەرجەم گروپە بیروباوەڕ خراپەکانی وەکو: (إسماعيلية، والنصيرية، والدروز، والرافضة) وە جگە لەوانیش.

٢ ـ **بیدعەی کرداری، ئەویش چەند جۆرێکە**

**١ ـ بیدعە کردن لە بنەڕەتی پەرستندا، وەکو داهێنانی پەرستنێك کە** هیچ بنەڕەتێکی نییەلە شەرعدا، وەکو داهێنانی نوێژێك کە شەرعی نییە، یان ڕۆژوو گرتنێك کە هیچ بنەڕەتێکی نییەلە شەرعدا، وە داهێنانی بۆنە و جەژنێك کە لە

---

[١٠٥] بڕوانە: الإعتصام للشاطبي، ١/٥٧-٦٠، و ٤٧٩، ٤٨٥، ٤٩٨، والأمر بالإتباع والنهي عن الإبتداع= لجلال الدين السيوطي، ص٢٠٥، وأصول في البدع، للشيخ محمد أحمد العدوي، ص٧٠، وحقيقة البدعة وأحكامها، لسعيد بن ناصر الغامدي، ٢/ ٣٧-٥٨، وتنبيه أولي الأبصار إلى كمال الدين وما في البدع من أخطار، للدكتور صالح السحيمي ص٩٧، وعلم أصول البدع للشيخ علي بن حسن الأثري، ص١٠٧، وتحذير المسلمين عن الإبتداع والبدع في الدين، للشيخ أحمد بن حجر آل بوطامي، ص٨٣.

ئیسلامدا نەبێت، وە کردنی یادی لە دایك بوون کە لە بنەڕەتدا شەرعی نییە بەڵکو داب و نەریتی گاورەکانە.

٢ - **زیادە کردن لە عیبادەتێکی شەرعیدا**، وەکو زیاد کردنی ڕکاتێك لە نوێژی نیوەڕۆ یان عەسردا.

٣ - **بیدعەو زیادکردن لە شێوازی ئەنجامدانی عیبادەتێکی شەرعیدا**، وەکو کردنی عیبادەتێك بەشێوازێکی ناشەرعی، یان وەکو کردنی زیکرەکانی دوای نوێژە فەرزەکان بەدەنگی بەرزو بە جەماعەت، یان قورس کردنی عیبادەت لەسەر خۆت بەڕادەیەك کە لە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەربچێت.

٤ - **تایبەت کردنی کاتێك بە کردنی عیبادەتێك کە شەرع دیاری نەکردووە دەبێتە بیدعە**، وەکو تایبەت کردنی نیوەی مانگی شعبان بە گرتنی ڕۆژوو، یان تایبەت کردنی شەوەکەی بە کردنی شەو نوێژ، هەر چەندە ڕۆژوو گرتن و شەو نوێژ کردن دوو عیبادەتی زۆر خێرن، بەڵام تایبەت کردنیان بە کاتێك کە شەرع دیاری نەکردووە دەبێتە بیدعە و پێویستی بەبەڵگە هەیە[١٠٦].

---

[١٠٦] **بڕوانە**: مجموع فتاوى شيخ الإسلام ابن تيمية، ٣٤٦/١٨، ٥، ٣٥-٤١٤، وكتاب التوحيد للعلامة الدكتور صالح الفوزان، ص ٨١-٨٢، ومجلة الدعوة، العدد ١١٣٩، ٩ رمضان، ١٤٠٨، مقال الدكتور صالح الفوزان في أنواع البدع، وتنبيه أولي الأبصار إلى كمال الدين وما في البدع من أخطار، للدكتور صالح السحيمي، ص ١٠٠.

## ۞ باسی شەشەم: حوكمی بیدعە لە دیندا

موسڵمانی خۆشەویست ئەوەی كە گومانی تێدا نییە ئەوەیە كە هەموو بیدعە و تازە داهێنراوێك لە دیندا حەرامەو سەرلێشێواوییە، لەبەر فەرموودەكەی پێغەمبەر (ﷺ) كە فەرموویەتی: ((وإيَّاكُم وَمُحدَثَاتِ الأمورِ، فإنَّ كلَّ مُحدثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَة))[١٠٧].

واتە: ئاگادارتان دەكەمەوە لە كارە تازە داهێنراوەكان (لە دیندا)، بێگومان هەموو تازە داهێنراوێك بیدعەیە، وەهەموو بیدعەو تازەو داهێنراوێك لە دیندا گومڕایی و سەرلێشێواوییە.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هذا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ))[١٠٨].

واتە: هەركەسێك كارێك دابهێنێت و فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت بە زیادكردنی ئەو كارە ئەوە بەسەریدا دەدرێتەوەو لێی وەرناگیرێت. وە لە گێڕانەوەیەكی تردا كە ئیمامی مسلم گێڕاویتیەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَنْ عَمِلَ عَمَلا لَيْسَ عَلَيْهِ أمْرُنا فَهُوَ رَدٌّ))[١٠٩].

واتە: هەركەسێك كارێك بكات (عیبادەتێك) فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت بۆ كردنی، ئەوە ئەو كارە كارێكە وەرناگیرێت بەڵكو دەدرێتەوە بەسەر خاوەنەكەیدا.

موسڵمانی خۆشەویست ئەم دوو فەرموودە پیرۆزەی پێغەمبەر (ﷺ) بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە شتێكی تازە داهێنراو لەم دینەدا دەبێتە بیدعە، وە هەموو

---

(١٠٧) أبو داود، ٤/٢٠١، برقم ٤٦٠٧، والترمذي، ٥/٤٤، برقم ٢٦٧٦، وصححه العلامة الألباني في "صحيح الجامع الصغير" ٢٥٤٩.

(١٠٨) رواه البخاري ٣/٢٢٢، برقم ٢٦٩٧، ومسلم، ٣/١٣٤٤، برقم ١٧١٨.

(١٠٩) متفق عليه: البخاري، ٣/٢٢٢، برقم ٢٦٩٧، ومسلم، ٣/١٣٤٣، برقم ١٧١٨.

بیدعەو كارێكی تازە داهێنراو حەرامەو سەرلیشیواوییە و وەرنەگیراوە، بۆیە هەموو كارێك كە پێی بووترێت بیدعە لە عیبادەتەكاندا حەرامە، بەڵام حەرامیش پلەی هەیە لە ڕووی تاوانەوە، **ئەویش بە پێی ئەو بیدعەیەی كە دەكرێت:**

* بیدعەی واهەیە كوفرە، وەكو: سوڕانەوە بەدەوری گۆڕەكاندا بە مەبەستی نزیك بوونەوە لێیان، یان سەربڕین و نەزر كردن بۆیان، یان پاڕانەوە لە مردووەكان و داوای كۆمەك و یارمەتی كردن لێیان، یان وەكو: بیدعەی جهمیة و معتزلة و رافضة)كان.

* بیدعەی واهەیە هۆكارەو سەر دەكێشێت بۆ كوفر، وەكو: دروست كردنی خانوو بەسەر گۆڕەكانەوە، وە نوێژ كردن و پاڕانەوە لەسەریان.

* بیدعەی واهەیە لە جۆری تاوانەكانە، وەكو: بیدعەی ژن نەهێنان و مانەوە بە گەنجی، یان ڕۆژوو گرتن و وەستان لەبەر خۆر گوایە تا ماندوو بێت خێری زیاترە، یان خۆ خەساندن بە مەبەستی نەمانی شەهوەت، وە جگە لە مانەش[110].

ئیمامی الشاطبي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) باسی ئەوەی كردووە كە تاوانی ئەو كەسانەی بیدعە دەكەن لە یەك ئاستدا نین، بەڵكو بە چەند پلەیەكی جیاوازە، جیاوازی ئەو تاوانەش لە چەند ڕوویەكەوەیە، بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

١ - لەو ڕووەوەی كە بیدعەچییەكە بانگەشەی ئیجتیهاد دەكات یان كەسێكی شوێن كەوتووە.

٢ - لەو ڕووەوەی كە بیدعەكە لە شتە پێویستیەكاندا دەكرێت وەكو: دین،،نەفس ،عەقڵ ،ماڵ، وە جگە لەمانەش.

٣ - لەو ڕووەوەی كە بیدعەچییەكە ئایا بە شاراوەیی دەیكات یان بە ئاشكرا دەیكات؟

---

[110] بڕوانە: كتاب التوحيد للعلامة الدكتور صالح بن فوزان الفوزان، ص ٨٢.

٤ ـ لەو ڕووەوەی کە بیدعەچییەکە دەعوەی بۆ دەکات و خەڵکی بۆ لا بانگ دەکات، یان نا؟

٥ ـ لەو ڕووەوەی ئایا بیدعەچییەکە دەرچووە لە ئەهلی سوننە یان نا؟

٦ ـ لەو ڕووەوەی بیدعەکە حەقیقیە یان زیاد کراوە.

٧ ـ لەو ڕووەوەی ئایا بیدعەکە ڕوون و ئاشکرایە یان ئاڵۆزە؟

٨ ـ لەو ڕووەوەی ئایا کردنی ئەو بیدعەیە کوفرە یان نا؟

٩ ـ لەو ڕووەوەی ئایا بیدعەچییەکە سورە لەسەر کردنی ئەو بیدعەیە بە بەردەوامی، یان بەردەوام نییە بەڵکو لە بەر هۆیەك دەیکات و دوایی وازی لێدێنێت؟

ئیمامی الشاطي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ئەوەی ڕوون کردۆتەوە کە بیدعە لە یەك ئاستدا نین لە ڕووی تاوانەوە بەڵکو جیاوازەو بەپێی بیدعەکە حوکم دەدرێت بەسەریدا[111]، وە ئەوەشی ڕوون کردۆتەوە کە بیدعە چەند پلەیەکی هەیە، هەیانە حەرامەو هەیانە مکروه[112]، بەڵام وەسف کردنی بیدعە بە سەرلێشێواوی هەموو جۆرەکانی دەگرێتەوە[113].

**بۆیە بیدعە بە پێی جیاوازی تاوانیان دابەش دەبێت بۆ سێ بەش:**

١ ـ بیدعەی واهەیە کوفری ڕوون و ئاشکرایە[114].

٢ ـ بیدعەی واهەیە لە ڕیزی تاوانە گەورەکانە[115].

---

[111] بڕوانە. الاعتصام للشاطي، ١/ ٢١٦ – ٢٢٤، و٢/٥١٥ – ٥٥٩

[112] ئەم دابەش کردنە، دابەش کردنێکی هەڵەیە، چونکە هیچ بیدعەیەکی (مَکرُوه) نییە لە شەرعدا بەو مانایەی کە ئەگەر نەیکەیت خێرت بگات و ئەگەر بیکەیت تاوانت ناگات، بەڵکو بیدعە هەمووی گومڕاییە (وكل بدعة ضلالة).

[113] بڕوانە. الاعتصام للشاطي، ٢/ ٥٣٠

[114] بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ٢/ ٥١٦

[115] بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ٢/ ٥١٧ و ٢/ ٥٤٣ – ٥٥٠.

٣ ـ بیدعەی واهەیە تاوانێکە لـە تاوانـە بـچوکەکان[١١٦] ، وە بیدعـەی بـچوك چەند مەرجێکی هەیە بۆ ئەوەی لە جۆری تاوانە بچوکەکان بێت، **کە ئەمانەن:**

١ ـ نابێت بەردەوام بێت لەسەرکردنی، ئەگەر بەردەوام بێـت لەسـەر کردنـی ئەوە دەبێتە تاوانی گەورە.

٢ ـ دەعوەو بانگەوازی بۆ نەکات، ئەگەر دەعوەی بۆ بکات دەبێتـە بیدعـەو تاوانی گەورە، چونکە خەڵکی دەیکەن و زۆر کاری پێ دەکرێت.

٣ ـ لـەناو کۆمـەڵ و قەڵـەباغی موسـڵماناندا نـەیکات، وە لـەو شـوێنانەدا نەیکات کە سوننەتی تێدا دەکرێت.

٤ ـ ئەو بیدعەیە بە بچوك و بێڕێز سـەیر نـەکات، چـونکە ئـەوە سـوکایەتی کردنە پێی، وە سوکایەتی کردن بە تاوان گەورەترە لە تاوان[١١٧].

نـاوی سەرلێـشێواوی بەسـەر هەرسـێ بەشـەکەدا دادەبرێـت، لەبـەر ئـەوەی پێغەمبەر (ﷺ) هەموو جۆرە بیدعەیەکی بەسەر لێشێواوی نـاو بـردووە، ئـەویش بیدعەی پێ لـە دیـن دەرچـوون و بیدعـەی پـێ تـاوان بـار بـوون دەگرێتـەوە جـا تاوانەکە گەورە بێت یان بچوك[١١٨].

هەندێك لە زاناکان بیدعە دابەش دەکەن بەسەر پێنج حوکمـە شـەرعیەکەدا، بۆیە دەڵێن: بیدعـە هەیـە کردنـی واجبـە، بیدعـە هەیـە کردنـی حەرامە،بیدعـەی واهەیە کردنی سوننەتە، هەیانە کردنی مَکروهَ، هەیانە مُباحَ.

ئـەم دابـەش کردنــە پێــچەوانەی فەرموودەکـەی پێغەمبــەرە (ﷺ) کــە دەفەرموێت: ((فإنَّ كل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة))[١١٩].

---

[١١٦] بڕوانە: الإعتصام للشاطي، ٢/٥١٧ و ٢/٥٣٩، ٥٤٣ – ٥٥٠.

[١١٧] بۆ زیاتر شارەزا بوون لە شەرحی ئەم مەرجانە، بڕوانە: الاعتصام للشاطي، ٢/٥٥١ – ٥٥٩

[١١٨] بڕوانە: الإعتصام للشاطي، ٢/٥١٦

[١١٩] رواه أبو داوود، ٤/٢٠١، برقم ٤٦٠٧، والترمذي، ٥/٤٤، برقم ٢٦٧٦.

وە ئیمامی الشاطبي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) پاش ئەوەی باسی ئەم دابەش کردنە و خاوەنەکانیان دەکات و بەر پەرچیان دەداتەوە، دەفەرموێت:

(وەڵام بۆ ئەم بوچوونە ئەوەیە: ئەم دابەش کردنە کارێکی داهێنراوە و هیچ بەڵگەیەکی شەرعی لەسەر نییە، بەڵکو هەر خۆی لە خۆیدا ڕەتکراوەیە، لەبەر ئەوەی بیدعە لە بنەڕەتدا بەڵگەی لەسەر نییە: نەلە دەقەکانی قورئانی پیرۆز و نەلە سوننەت و نەلە بنەماکانیان، چونکە ئەگەر بەڵگە لەسەر واجبێتی یان سوننەتێتی یان حەلاڵێتی کارێك هەبێت ئەوە نابێتە بیدعە، بەڵکو کردنی ئەو کارە ئەچێتە ئەو ژێر کارانەی کە فەرمانی پێ کراوە یان تیایدا سەر پشکی بۆ کردنی، بۆیە کۆ کردنەوەی ئەو کارانە بیدعەیە لە کاتێکدا بەڵگە لەسەر واجبێتی یان سوننەتەتێتی یان حەلاڵێتی هەبێت کۆ کردنەوەی دوو شتی زۆر دژ بەیەکن)[١٢٠].

۞ **باسی حەوتەم: جۆرەکانی ئەو بیدعانەی کەلەسەر گۆرەکان دەکرێن:**

**جۆری یەکەم:** کەسانێك سەردانی گۆڕەکان دەکەن بۆداوا کردنی پێویستیەکانیان لە مردووەکان، ئەو کارە هاوشێوەی کاری بت پەرستەکانە، هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِۦ فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا ﴿٥٦﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ ۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا ﴿٥٧﴾ ﴾ (الإسراء: ٥٦-٥٧).

واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بەو موشریکانە بڵێ: کە جگە لە خوای پەروەردگار ئەپەرستن و گومانتان وایە جگە لە خوای پەروەردگار وەڵامتان ئەداتەوە بێ گومان بن کە بەهیچ شێوەیەك ئەو پەرستراوانە ناتوانن ناخۆشی و

---

[١٢٠] بڕوانە: الإعتصام للشاطبي، ١/٢٤٦.

ناڕەحەتیتان بە سەر لابەرن و بیدەن بە سەر کەسانێکی تردا، دەی کەواتە تەنها خوای پەروەردگار توانای بەسەر هەموو کارێکدا هەیە .

﴿ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ ۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا ﴿٥٧﴾ ﴾ (الإسراء: ٥٧)

واتە: ئەی هاوەڵ بڕیاردەران ئەوانەی کە ئێوە جگە لەخوای پەروەردگار لێیان دەپاڕێنەوە و ئەیان پەرستن، ئەوان خۆیان باوەڕیان هێناوەو خۆیان بە بەندەو بێ دەسەلات دەزانن بەرامبەر بە خوای پەروەردگار، وە ئەیانەوێت لە خوای پەروەردگار نزیك ببنەوە بە باوەڕهێنان و کردنی کردەوەی چاکە، وە ئومێدیان بەڕەحم و بەزەیی خوای پەروەردگار هەیە و لە سزاشی ئەترسن، ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بەڕاستی سزای پەروەردگارت مەترسی لێکراوە.

بۆیە هەرکەسێك بپاڕێتەوەو داوا بکات لە پێغەمبەرێك (ﷺ) یان پیاو چاکێك، یان جۆرێك لە دەسەلاتی خوایەتیان تیدا بگێڕێت، ئەوە ئەم ئایەتە دەیگرێتەوە، ئایەتێکی گشتی یە بۆ هەموو ئەو کەسانەی کەلە جگە لە خوای پەروەردگار دەپاڕێنەوە، لە کاتێکدا ئەو هاوار بۆکراوانە خۆیان سەرقاڵی ڕازی کردنی خوای پەروەردگارن، وە ئومێدیان بە ڕەحمی خوای پەروەردگارەو لە سزاشی دەترسن، بۆیە هەرکەسێك بپاڕێتەوەو داوا بکات لە مردوویەك یان کەسێکی نادیاری، وەك: پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاو چاکان، جا ئەو داوا کردنە بەدەم (وەك بڵێت: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) یان فلان کەس بە هانامەوە وەرەو فریام بکەوە، یان جگە لەمانە...) ئەوە گەورەترین تاوانی کردووە، ئەویش ئەو شیرکەیە کە بە هیچ شێوەیەك خوای پەروەردگار لێی خۆش نابێت مەگەر بە تەوبە کردن، هەرکەسێك زیادەڕەوی بکات لە پێغەمبەرێك (عليه السلام)، یان پیاو چاکێك، وە جۆرێك لە جۆرەکانی عیبادەتیان تێدا بگێڕێت، بۆ نموونە بڵێت:

ئەی سەیدم ئەی گەورەم شێخم سەرم كەوێنە، یان یارمەتیم بدە، یان هێزوو توانام بدە، یان بەهانامەوە بێیت، یان بڵێت ڕزقم بدە، یان بڵێت: من لە ژێرسایەو چاودێری تۆدام، وە جگە لەم وتانەش كە هەموویان شیرك و سەرلێشێواوین، ئەو كەسەی دەیكات داوای لێ دەكرێت تەوبە بكات، ئەگەر تەوبەی كرد ئەوە وازی لێدەهێنرێت، ئەگەر تەوبەی نەكرد دەكوژرێت لە لایەن كاربەدەستی موسڵمانانەوە، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام) ناردووە و كتێبەكانی دابەزاندووە، بۆ ئەوەی بەتەنها بپەرسترێت و هیچ شتێك نەكرێت بە هاوەڵی.

**جۆری دووەم:** كەسێك كاتێك زیارەت و سەردانی گۆڕەكان ئەكات مەبەستی پێی پاڕانەوەیە لە خوای گەورە بە مردوەكان، ئەم كارە بیدعەیە و داهێنراوە لە ئیسلامدا، بەڵام وەكو خاڵی پێشوو نییە تا بگاتە ڕادەی شیركی گەورە، زۆربەی ئەوانەی تەوەسول دەكەن بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاو چاكان دەڵێن: نزیك دەبمەوە لە تۆ ئەی خوای پەروەردگار بە پێغەمبەرەكەت (ﷺ) یان پێغەمبەرانت (علیهم الصلاة والسلام) یان فریشتەكانت یان بەندە پیاو چاكەكانت، یان بەحەقی فلانە شێخ، یان دەڵێن: خوایە لێت نزیك دەبمەوە بە حورمەت و ڕێزی فلانە شێخ، یان خوایە لێت نزیك دەبمەوە بە قەڵەم و (لوح المحفوظ)، یان جگە لەو شتانە كە لە پاڕانەوەكانیاندا دەیڵێن، كە هەر هەمووی بیدعەیە و كارێكی تازە داهێنراوی خراپە، بەڵام ئەوەی كە لە سوننەتدا هاتووە نزیك بوونەوە لە خوای پەروەردگار بە ناوو سیفاتە جوانەكانی دەبێت، یان بە كردنی كردەوە چاكەكان دەبێت، هەروەك لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا بەسەر هاتی ئەو سێ كەسەی كەچوونە ئەشكەوتەكەوە هاتووە، وەهەروەها موسڵمان دەتوانێت بە دوعای موسڵمانێكی زیندووی حازر تەوەسول بكات و لە خوای پەروەردگار نزیك ببێتەوە.

**جۆری سێیەم:** هەرکەسێك گومانی وابێت پاڕانەوە لە لای گۆڕەکان گیرایەو وەڵام دراوەیە، یان بڵێت پاڕانەوە لەلای گۆڕەکان باشترە وەك پاڕانەوە لە مزگەوتەکاندا، ئەو کارە بە یەکدەنگی زانایان کارێك و گومانێکی خراپە بەبێ بوونی خیلاف لە نێوانیاندا کە کارێکی بیدعەو خراپە، کارێکە نە خوای پەروەردگار بە شەرعی داناوە، وە نە پێغەمبەرەکەشی (ﷺ)، وەهیچ یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ)، وە شوێن کەوتوانیان وە زانایان و پێشەوای دین ئەم کارەیان نەکردووە، بێگومان هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) چەندین جار تووشی ووشکە ساڵی و ناخۆشی و ناڕەحەتی دەبوون هیچ کاتێك نەدەچوونە سەر گۆڕەکەی و بپاڕێنەوە، بەڵکو ئیمامی عومەر(ﷺ) داوای لە ئیمامی عباسی (ﷺ) مامی پێغەمبەر (ﷺ) دەکرد تا دوعای باران بارینیان بۆ بکات، هەر بۆیە سەلەف و پیاو چاکانی پێشین نەهی و ڕێگریان کردووە لە پاڕانەوە لە لای گۆڕەکان، هەروەك جارێکیان علي کوڕی حسين (رضي الله عنهم) پیاوێکی بینی لە کونێکەوە دەچووە لای گۆڕەکەی پێغەمبەر (ﷺ) دەپاڕایەوە، ئەویش فەرموی: ئایا فەرمودەیەکت پێ بڵێم کە لە باوکمەوە (ئیمامی عـــي) بیستوومە و ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بیستویەتی کە فەرمویەتی: ((لاَ تَجْعَلُوا قَبْرِي عِيـدًا، وَلاَ تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قُبُورًا، وَصَلُّوا عَلَيَّ وَسَلِّمُوا، حَيْثُمَا كُنْتُم فَسَتَبْلُغُنِي سَلاَمُكُم وَصَلاَتُكُم))[121].

واتە: گۆڕەکەم مەکەن بە جەژنگا، وەماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕستان (کردنی ماڵەکان بە گۆڕ ئەوەیە: قورئانی تێدا نەخوێندرێت و نوێژە سوننەتەکانی تێدا نەکرێت) وە سەڵاوتم لەسەر بڵێن چونکە سەڵاواتەکانتان پێم ئەگات لەهەر کوێیەك بن، چونکە خوای پەروەردگار کۆمەڵە مەلائیکەیەکی هەیە بەردەوام

(121) رواه إسماعيل القاضي في كتاب فضل الصلاة على النبي ﷺ، ص٣٤، وصححه الألباني في نفس المرجع وله طرق وروايات ذكرها في كتابه تحذير الساجد من اتخاذ القبور مساجد، ص١٤٠.

ئەسورێنەوە سەڵات و سەلامـــی ئەو کـــەسانەم پـێ ئەگەیـەنن لـە ئوممەتەکـەم کـە سـەلامم لێ ئەکەن.

موسڵمانی خۆشەویست ئەوەی بەڵگە بێت لەم فەرمودەیەدا ئەوەیە: ئەگـەر گۆڕی پێغەمبەر (ﷺ) کە پیرۆزترین گۆڕە لەسـەر ڕووی زەویـدا نـەهی و ڕێگـری لێکرابێت کە نەکرێتە جەژنگا، ئەوە گۆڕی کەسانی تر "هەر کەسانێك بن" زۆر لـە پێش ترە تا ڕێگری لێبکرێت و نەکرێتە جەژنگا (واتە: زۆر ڕوویان تێبکرێـت و زۆر سەردانیان بکرێت)[١٢٢].

وە أبو هريرة (ﷺ) دەفـەرمووێت: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمویـەتی: ((لا تَجعَلُـوا بُيوتَكُم قُبوراً، وَلا تَجعَلُوا قَبري عِيداً، وَصَلُّوا عَلَيَّ فَـإنَّ صَـلاتَكُم تَـبلُغُني حَيـثُ كُنتُم))[١٢٣].

واتە: ماڵـەکانتان مەکـەن بـە گۆڕسـتان (کردنـی ماڵـەکان بـە گـۆڕ ئەوەیـە: قورئـانی تێـدا نـەخوێنرێت و نوێـژە سوننەتەکانی تێـدا نـەکرێت) وە گۆڕەکـەم مەکەن بە جەژنگا، وە سەڵاواتم لەسەر بڵێن چونکە سەڵاواتەکانتان پێم ئـەگات لەهەر کوێیەك بن.

---

[١٢٢] بڕوانە: الدرر السنية في الأجوبة النجدية لعبد الرحمن بن قاسم ٦/١٦٥-١٧٤.

[١٢٣] أبو داود، كتاب المناسك، باب زيارة القبور، ٢/٢١٨ بإسناد حسن، وأحمد ٢/٣٥٧، وە بڕوانـە: صحيح سنن أبي داود ١/٣٨٣.

**◈ باسی هەشتەم: بیدعە باوو بڵاوەکانی ئەم سەردەمە:**

بیدعە باوو بڵاوەکانی سەردەم زۆر زۆرن کە ناتوانرێت هەموویان بژمێردرێت ، بەڵام بۆ نموونە هێنانەوە نەك وەکو دیاری کردنیان ئەمانەیان باس دەکەین:

**یەکەم: بیدعەی ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی لە دایك بوونی پێغەمبەر (ﷺ):**

ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی لە دایك بوونی پێغەمبەر (ﷺ) بیدعەو کارێکی خراپە، یەکەم کەس کە ئەو بیدعەیەی داهێنا (العَبیدیّون) بوون لە سەدەی چواری کۆچیدا بوو، بۆیە زانایانی خەم خۆری ئیسلام هەر لە کۆنەوەو تا ئێستا پوچەڵی و نادروستێتی ئەم کارەیان ڕوون کردۆتەوە، وەڕەددی ئەو کەسانەیان داوەتەوە کە دایان هێناوەو کاری پێدەکەن، بۆیە دروست نییە ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی لە دایك بوونی پێغەمبەر (ﷺ)، لەبەر چەندین بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا، لەوانە:

١ ـ ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی لە دایك بوونی پێغەمبەر (ﷺ) یەکێکە لەو بیدعە تازە داهێنراوانەی کە خوای پەروەردگار بەڵگەیەکی لەسەر کردن و دروستێتی دانەبەزاندووە، وە لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) نەبە ووتەو نەبە کردەوەو نەبەبێدەنگ بوونی لەسەری بەشەرعی نەگێڕاوە، لە کاتێکدا تەنها ئەو پێشەواو ئیماممانە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ﴾ (الحشر: ٧) .

واتە: ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆی هێناون (لە قورئانی پیرۆز و سوننەت) وەریبگرن و هەر فەرمانێکی پێکردن بە گوێی بکەن، وە هەر شتێکی لێ قەدەغە کردن و نەهی لێ کردن لێی یەکسەر لێی دوور بکەونەوە و مەیکەن، چونکە بەڕاستی خوای پەروەردگار سزای زۆر بە توندی دەستێنێت لە کەسانێك کە سەرپێچی فەرمانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەن.

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴾ (الأحزاب: ٢١) .

واتە: بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا (ﷺ) جوانترین و چاکترین نموونە هەیە تا چاوی لێ بکەن و شوێنی بکەون، بە تایبەتی بۆ کەسانێك کە ڕەزامەندی خوایان مەبەستە، وە سەرفرازی دوا ڕۆژ ئاواتیانە، هەمیشە و بەردەوام یادی خوا بەزۆری دەکەن و زمانیان پاراوە بە یادی ئەو.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((مَن أحدَثَ في أمرِنا هذا ما لَيسَ مِنهُ فَهُوَ رَدٌّ))[١٢٤].

واتە: هەرکەسێك کارێك بکات و فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت بە کردنی ئەوە بەسەریدا دەدرێتەوەو لێی وەرناگیرێت.

٢ ـ خەلیفە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی بەڕێزی هیچیان ئاهەنگیان نەگێڕاوە بە بۆنەی لە دایك بوونی پێغەمبەرەوە (ﷺ)، وە موسڵمانانیشیان بانگەواز نەکردووە بۆ ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی لە دایك بوونی پێغەمبەرەوە (ﷺ)، لە کاتێکدا ئەوان لە دوای پێغەمبەر (ﷺ) باشترین و چاکترینی ئەم ئوممەتەن، هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بە خەلیفە بەڕێزەکانی دەفەرموێت: ((عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ مِن بَعدي، عَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُمْ وَالْمُحْدَثَاتِ، فَإِنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ ))[١٢٥].

واتە: ئامۆژگاریتان دەکەم و فەرمانتان پێدەکەم هەرکاتێك ناکۆکی و دووبەرەکیتان بینی لە ناو موسڵماناندا دەست بگرن بە سوننەتەکانی من و مەنهەج و ڕێبازی خەلیفە ڕێپیشاندەرو هیدایەتدراوەکانم لە دوای مردنی من، سووربن لەسەر دەست گرتن پێیانەوە هەروەکو چۆن بە کاکیلەکانتان شتێك

---

[١٢٤] متفق عليه: البخاري، برقم ٢٦٩٧، ومسلم، برقم ١٧١٨.

[١٢٥] أبو داود، كتاب السنة، باب في لزوم السنة، ٤/٢٠١، برقم ٤٧٠٧، والترمذي، كتاب العلم، باب ما جاء في الأخذ بالسنة واجتناب البدع، ٥/٤٤ برقم ٢٦٧٦، وقال. هذا حديث حسن صحيح، وابن ماجه في المقدمة،باب اتباع سنة الخلفاء الراشدين المهديين، ١/١٥-١٦،برقم ٤٢، ٤٣، ٤٤،وأحمد ٤/٤٦-٤٧.

دەگرن، وە ئامۆژگاریتان دەکەم و دەتان ترسێنم لە هەموو بیدعەو کارە تازە داهێنراوەکان لە دیندا، چونکە هەموو بیدعەو تازە داهێنراوێك لەدیندا گومڕایی و سەرلێشێواوییە.

٣ ـ ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی لە دایك بوونی پێغەمبەر (ﷺ) لە داهێنراو ڕێگای کەسانی سەرلێشێواو و دڵ لاچوو لەسەر حەقە، چونکە یەکەم کەس کە ئەو بیدعەیەی داهێنا (الفاطميون العبيديون) بوون لە سەدەی چواری کۆچیدا بوو، خۆیان دابوە پاڵ (فاطمة)ی کچی پێغەمبەر (ﷺ)، بە فێڵ و تەڵەکەو درۆ، کەلە ڕاستیدا جولەکە بوون، وە دەوترێت: ئاگر پەرست بوونە، وە دەوترێت لە بنەڕەتدا لە بێباوەڕەکان بوونە[١٢٦] ، یەکەم کەسیان (المعز لدين الله العبيدي) مەغریبی بوو کە لە مانگی (شوّال)ی ساڵی ٣٦١ کۆچی مەغریبی بە جێهێشت و بەرەو وڵاتی میصر کەوتە ڕێ لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٣٦٢ کۆچی گەیشتە مصر[١٢٧] ، ئایا پاش ئەمە بۆ هیچ موسڵمانێکی عاقڵ و ژیر هەیە کە تەقلیدی رافضة (شیعە) بکات و شوێنی مەنهەج و ڕێبازی پوچەڵیان بکەوێت و پێچەوانەی مەنهەج و ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ) بکات؟

٤ ـ خوای پەروەردگار دینی تەواو کردووە هیچ پێویستی بە زیادە نییە، هەروەك دەفەرموێت: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ

---

[١٢٦] بڕوانە: الإبداع في مضار الابتداع، للشيخ علي محفوظ، ص٢٥١، بڕوانە: التبرك: أنواعه وأحكامه، للدكتور ناصر بن عبد الرحمن الجديع، ص٣٥٩-٣٧٣، بڕوانە: تنبيه أولي الأبصار إلى كمال الدين وما في البدع من أخطار، للدكتور صالح السحيمي، ص٢٣٢.

[١٢٧] بڕوانە: البداية والنهاية: لابن كثير، ١١/٢٧٢-٢٧٣، ٣٤٥، ١٢/٢٦٧-٢٦٨، و ٦/٢٣٢، ١٢/٦٣، ١١/١٦١، ١٢/١٣، ١٢/٢٦٦، بڕوانە: سير أعلام النبلاء للذهبي، ١٥/١٥٩-٢١٥، وذكر أن آخر ملوك العبيدية: العاضد لدين الله، قتله صلاح الدين الأيوبي سنة ٥٦٤هـ، قال: "تلاشى أمر العاضد مع صلاح الدين إلى أن خلعه وخطب لبني العباس واستأصل شأفة بني عبيد ومحق دولة الرفض، وكانوا أربعة عشر متخلفاً لا خليفة، والعاضد في اللغة: القاطع، فكان هذا عاضداً لدولة أهل بيته، ١٥/٢١٢.

ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ۝٣ ﴾ (المائدة: ٣)

واتـە: ئـەمڕۆ دیـنم بـۆ تـەواوكردن و نیعمـەتی خـۆم ڕژانـدووە بەسـەرتاندا وەڕازیم لێتان (ئەی موسوڵمانان) كە ئیسلام ئاینتان بێت و هیچ مەنهـەج و ڕێبـاز و ئاینێكی تر نەكەنە ئاینی خۆتان.

زانای پایە بـەرز إبن كثير (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لـە تەفسیری ئـەم ئایەتـەدا فەرمویەتی: (ئەم نیعمەت و بەخششەی خوای پەروەردگار گەورەترین نیعمـەت و بەخشـشە بەسـەر ئـەم ئوممەتـەوە لـە كاتێكدا ئاینەكـەی بـۆ تـەواو كـردوون، پێویستیان بە هیچ ئاینێك نییە جگە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام، وە پێویستیان بـە هیچ پێغەمبەرێك (ﷺ) نییـە جگـە لـە پێغەمبـەری خۆیـان (ﷺ)، بۆیـە خـوای پەروەردگار پێغەمبەری (ﷺ) گێڕاوە بـە دوایـن پێغەمبـەر (ﷺ)، وە ڕەوانـەی كردووە بۆ هـەموو مـرۆڤ و جنۆكـەكان، هـیچ حـەڵاڵێك نییـە مەگـەر ئـەو حـەڵاڵی كردبێت، وە هیچ حەرامێك نییە مەگەر ئەو حـەرامی كردبێـت، وە هـیچ مەنهـەج و ڕێباز و ئاینێك حەق و ڕاسـت نییـە مەگـەر ئـەو ئاینـەی كـە پێغەمبـەر (ﷺ) بـە دینـی زانیبێـت، وە هـەر شـتێك ئـەو هـەواڵی پێـدابێت حـەق و ڕاسـتە هـیچ درۆو دواكەوتنی تێدا نییە)[١٢٨].

﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ هـەم دیـن لەهـەموو ڕویەكـەوە تـەواوە و پێویستی بە زیادو كەم نییـە وە هـەم خـوای پـەروەردگار تـەواو نیعمـەتی خـۆی ڕشتووە بەسەر موسوڵماناندا.

وە پێغەمبەر (ﷺ) دینی ڕوون كردۆتەوە بۆ موسڵمانان بە جوانترین شـێوە، هیچ ڕێگەو كارێك كە گەیەنەر بێت بـەرەو بەهەشـت ئـیللا ڕوونـی كردۆتـەوە، وە هـیچ ڕێگـەو كارێـك كـە گەیەنـەرو نزیـك خـەرەوە بێـت لـە دۆزەخ ئـیللا بـۆ

---

(١٢٨) بڕوانە: تفسير القرآن العظيم للإمام إبن كثير (رحمه الله تعالى) ٣/ ٢٦.

ئوممەتەکەی ڕوون کردۆتەوە و ترساندویانێتی لێی، وە ئەوەی کە زانراوەو گومانی تێدا نییە ئەوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) بەڕێزترینی ناو هەموو پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام)، وەکۆتایی هەموویانە، وە بە تەواوترین شێوە دینی گەیاندووە، وە دڵسۆزترین کەس بووە بۆ موسڵمانان، بۆیە ئەگەر ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی لە دایك بوونییەوە لە دین بوایەو کارێکی خێر بوایە و خوای پەروەردگار پێی ڕازی بوایە، ئەوە ڕوونی دەکردەوە بۆ ئوممەتەکەی، یان تا لە ژیانا مابوو خۆی دەیکرد.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((إِنَّهُ لَمْ يَكُنْ نَبِيٌّ قَبْلِي إِلاَّ كَانَ حَقًّا عَلَيْهِ أَنْ يَدُلَّ أُمَّتَهُ عَلَى خَيْرِ مَا يَعْلَمُهُ لَهُمْ، وَيُنْذِرَهُمْ شَرَّ مَا يَعْلَمُهُ لَهُمْ))[١٢٩].

واتە: خوای پەروەردگار هیچ پێغەمبەرێکی (عليه السلام) نەناردووە ئیللا پێویست بووە لەسەری کە ئوممەتەکەی ڕێنمونی بکات بۆ هەموو خێرو چاکەیەك، کە زانیبێتی کردنی ئەو کارە خێرو چاکەی تێدایە بۆیان، وە پێوست بووە لەسەری کە ئوممەتەکەی ئاگادار بکاتەوە لە هەموو شەڕو خراپەیەك، کە زانیبێتی کردنی ئەو کارە زیان و خراپەی تێدایە بۆیان.

٥ ـ داهێنانی هاوشێوەی ئەم جۆرە یادوو بۆنە و بیدعەو تازە داهێنراوانە، وای لێ تێدەگەیت کە خوای پەروەردگار دینی بۆ ئەم ئوممەتە تەواو نەکردووە، بۆیە دەبێت شەرعێك دابنرێت تا دینی پێ تەواو ببێت، وە داهێنانی ئەم جۆرە بیدعەو تازە داهێنراوانە ئەوەی لێ تێدەگەیت کە پێغەمبەر (ﷺ) شەرعی بەتەواوی ڕوون نەکردۆتەوە کە پێویستە ڕوون بکرێتەوە بۆ ئەم ئوممەتە، هەتا ئەو بیدعەچییانە هاتن کۆمەڵە بیدعەیەکیان داهێنا لە دیندا کە خوای پەروەردگار بە هیچ شێوەیەك بەڵگەی لەسەر دروستێتی دانەبەزاندووە، بە گومانی خۆیان ئەو کارە نزیکیان دەکاتەوە لە خوای پەروەردگار، گومانی تێدا

---

[١٢٩] مسلم، كتاب الإمارة، باب وجوب الوفاء ببيعة الخلفاء: الأول فالأول، ٢/١٤٧٣، برقم ١٨٤٤

نییە کە ئەمە کارێکی زۆر ترسناکە، وە پشت هەڵکردنە لە فەرمانەکانی خوای پەروەردگار و پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، بەڕاستی خوای پەروەردگار دینی تەواو کردووەو نیعمەتی تەواوی خۆی ڕژاندووە بەسەر بەندەکانیدا.

٦ ـ زانایان بە ڕوون و ئاشکرایی ئینکاریان کردووە لە بیدعەی ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی لە دایك بوونی پێغەمبەر (ﷺ)، وە موسڵمانانیان لە خراپێتی ئەم کارە ترساندووەو ئاگاداریان کردونەتەوە، ئەویش کار کردنە بە دەقەکانی قورئانی پیرۆز و سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، کە دەمان ترسێنن لە بیدعە کردن لە دیندا، وە فەرمانمان پێدەکەن بە شوێن کەوتنی پێغەمبەر (ﷺ)، ترساندنمان لە پێچەوانەکردنی فەرمانەکانی لە وتەو کردەوەو بیروباوەڕدا.

٧ ـ ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی لە دایك بوونی پێغەمبەر (ﷺ) خۆشەویستی پێغەمبەری (ﷺ) پێنایاتەدی، بەڵکو خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) بە شوێن کەوتن و جێبەجێکردنی سوننەتەکانی و گوێڕایەڵی کردنی دێتەدی، هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ ﴾ (آل عمران: ٣١)

واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بە موسڵمانان بڵێ: ئەگەر ئێوە خوای پەروەردگارتان خۆش دەوێت ئەوە شوێنی من بکەون (بە جێبەجێکردنی سوننەتەکانی و گوێڕایەڵی کردنی)، ئەو کاتە ئەگەر بەتەواوی شوێنی فەرمانەکانی من کەوتن خوای پەروەردگار خۆشتانی دەوێت و لە تاوانەکانت خۆش دەبێت، وە خوای پەروەردگار زۆر لێخۆش بوو و بەبەزەییە.

٨ ـ ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی لە دایك بوونی پێغەمبەر (ﷺ)و کردنی ئەو یادە بە جەژنگا(ساڵانە دووبارە بکرێتەوە) خۆ شوبهاندنە بە گاورو جولەکە، لە کاتێکدا خوای پەروەردگار و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) نەهیان لێ کردووین کە خۆمان لێك بچوێنین پێیان یان شوێنیان بکەوین.

٩ ـ موسڵمانی ژیرو عاقڵ له خۆی بایی نابێت بەزۆری ئەو کەسانەی کە ئاهەنگ دەگێڕن بە بۆنەی لە دایك بوونی پێغەمبەر (ﷺ) لە زۆربەی شوێنەکاندا، چونکە حەق بەزۆری ئەو کەسانە ناناسرێتەوە کە ئەو کارە دەکەن، بەڵکو حەق بەبەڵگەی شەرعی دەناسرێتەوە، هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِي الْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ ﴿١١٦﴾ ﴾ (الأنعام:١١٦) .

واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر تۆ مل کەچی و گوێڕایەڵی زۆربەی کەسانی سەر زەوی بکەیت ئەوە لە ڕێبازی خوات لادەبەن و سەرلێشێواوت دەکەن.

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَا أَكْثَرُ النَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ ﴾ (يوسف).

واتە: دڵنیابە کە زۆربەی خەڵکی باوەڕدار نین، هەر چەندە تۆش بەپەرۆش بیت و هەوڵ بدەیت (تا ئیمان بێنن).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ ﴿١٣﴾ ﴾ (سبأ: ١٣).

واتە: کەم لەبەندەکانی من سوپاسگوزارن.

١٠ ـ بنەمایەکی شەرعیمان هەیە کە ئەمە دەقەکەیەتی: (رَدُّ ما تَنازَعَ فيهِ النّاسُ إلى كِتابِ اللهِ تَعالَى وَسُنَّةِ رَسُولِهِ ﷺ) .

واتە: گێڕانەوەی هەموو ئەو کارانەی کە موسڵمانان خیلافیان تێیدا هەیە دەبێت بۆ لای قورئانی پیرۆز و سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێت.

وەخوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ ۖ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٥٩﴾ ﴾ (النساء: ٥٩)

ئەی ئیمانداران گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرو (ﷺ) فەرمان ڕەواکان بکەن (کە لە موسڵمانانن لە بیروباوەڕو پابەندبووندا)، خۆ ئەگەر لە شتێکدا کێشە کەوتە

نێوانتان دەربارەی حوكمی خوایی، ئەوە ئەو كێشەیە بگێڕنەوە بۆلای خوای پەروەردگار و پێغەمبەرەكەی (ﷺ) (كە قورئانی پیرۆز و سوننەتەكانی پێغەمبەری (ﷺ) مەبەستە) ئەگەر ئێوە باوەڕی تەواوتان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، (ڕەفتاركردنتان) بەو شێوەیە چاكترین و باشترین سەرچاوەیە بۆ چارەسەری كێشەكانتان.

وە هەروەها دەفەرمووێت: ﴿ وَمَا ٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِيهِ مِن شَيۡءٖ فَحُكۡمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۚ ﴿١٠﴾ ﴾ (الشورى. ١٠)

واتە: ئەی موسڵمانان ئەگەر لەهەر شتێكدا كێشەو ڕاجیایتان هەبوو، ئەوە سەرئەنجامی بڕیارەكە هەر بۆ لای خوای پەروەردگار دەگەڕێتەوە (گێڕانەوەی كێشەكان تەنها بۆ قورئانی پیرۆزە لە گەڵ سوننەتدا).

وە ئەوەی كە گومانی تێدا نییە ئەوەیە: ئەگەر هەر كەسێك ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی لە دایك بوونی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بگێڕێتەوە بۆلای خواو پێغەمبەرەكەی (ﷺ)، ئەوە ئەبینێت خوای پەروەردگار فەرمانمان پێدەكات بە شوێن كەوتنی پێغەمبەر (ﷺ)، هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرمویت: ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْۚ ﴿٧﴾ ﴾ (الحشر. ٧)

واتە: ئەوەی كە پێغەمبەر (ﷺ) بۆی هێناون (لە قورئانی پیرۆز و سوننەت) وەریبگرن و هەر فەرمانێكی پێكردن بە گوێی بكەن، وە هەر شتێكی لێ قەدەغە كردن و نەهی لێ كردن یەكسەر لێی دوور بكەونەوە و مەیكەن، چونكە بەڕاستی خوای پەروەردگار سزای زۆر بە توندی دەستێنێت لە كەسانێك كە سەرپێچی فەرمانەكانی پێغەمبەر (ﷺ) دەكەن.

وە خوای پەروەردگار ئەوەمان بۆ ڕوون دەكاتەوە كە دینی تەواو كردووەو نیعمەتی تەواوی خۆی بەسەر ئیمانداراندا ڕشتووە، وە ئەو موسڵمانە دەبینێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی نەكردووە بە ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی لە دایك بونییەوە،

نـه خـۆی و نەهاوەڵانیـشی ئـەم کارەیـان نـەکردووە، بۆیـە لەمـەوە بۆمـان دەردەکەوێت کە ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی لە دایك بوونی پێغەمبـەرەوە (ﷺ) بـە هیچ شێوەیەك لەدیندا نییە، بەڵکو لە بیدعە تازە داهێنراوەکانە.

١١ ـ موسڵمانی خۆشەویست ئەوەی کە شەرعی بێت بۆ تـۆ بریتیـە لـە: بـە ڕۆژوو بوونی ڕۆژانی دووشـەممە ئەگـەر پێغەمبـەری خـوات (ﷺ) خـۆش دەوێـت، لەبەر ئەوەی کاتێك پرسیاریان لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد دەربارەی گرتنی ڕۆژوو لـە ڕۆژی دووشەممەدا، ئەویش فەرمووی: ((ذَلِكَ يَوْمٌ وُلِدْتُ فِيهِ ، وَبُعِثْتُ فِيهِ، وَأُنْـزِلَ عَلَيَّ فِيهِ))[١٣٠].

واتـە: ئـەو ڕۆژە ڕۆژێکـە تیایـدا لـە دایـك بوومـە، وە لـەو ڕۆژەدا بـووم بـە پێغەمبەر (ﷺ)، وە هەر لەو ڕۆژەدا قورئانی پیرۆزم بۆ سەر دابەزیوە.

موسـڵمانی خۆشەویـست ئـەوەی شـەرعی بێـت لێـرەدا ئەوەیـە: شـوێنی پێغەمبەر (ﷺ) بکەوین بە بەڕۆژوو بوونی ڕۆژانی دووشەم، نەك بە ئاهەنگ گێـڕان بە بۆنەی لە دایك بوونی پێغەمبەرەوە (ﷺ).

١٢ ـ گێڕانی جەژنی لە دایك بوونی پێغەمبەر (ﷺ) بـەدەر نییـە لـە چـەندین خراپەو تاوانکاری، بەڵکو پڕە لە تاوان و سەرپێچی، ئەمەش کەسێك هەستی پـێ دەکات کە ئەو ئاهەنگانە بە چـاوی خـۆی ببینێـت، **لـەو خراپـەو تـاوانکاریانـە، وەك نمونە نەك وەکو دیاری کردنی هەموویان:**

١ ـ زۆربەی ئەو سروودو پیاهەڵدانانـەی کـە لـەو بۆنەیـەدا دەوترێـت بـەدەر نییە لەبەکارهێنانی ووشەی شیرکی، وە ئەوەی دەوترێت زۆر زیادەڕەوی تێدایە، لـە کاتێکدا پێغەمبـەر (ﷺ) نـەهی لـێ کـردوین لـەزیاد پیاهەڵدان کەلـە سنوری

---

(١٣٠) صحيح مسلم عن أبي قتادة ﷺ، كتاب الصيام، باب استحباب صيام ثلاثة أيام من كل شهر، وصـوم يوم عرفة وعاشوراء، والإثنين والخميس، ٢/٨١٩، برقم ١١٦٢.

خۆیان دەریان بكەین، هەروەك دەفەرموێت: ((لاَ تُطْرُونِي كَمَا أَطْرَتِ النَّصَارَى ابْنَ مَرْيَمَ، فَإِنَّمَا أَنَا عَبْدُهُ، فَقُولُوا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ))[١٣١].

واتە: زیـاد بەشان و شەوكەتمدا هەڵمەدەن و لە سنوری بەندایەتیەوە دەرم مەكـەن بـۆ سـنوری خوایـەتی و پەرسـتراوێتی، هـەروەك چـۆن گاورەكـان زیادەڕەویـان كـرد لـە (عیـسای كـوڕی مـریم) (عليه السلام) هەنـدێكیان ئەوەنـدە زیادەڕەویـان كـرد تیایـدا ووتیـان خوایـە، هەنـدێكیان ئـەڵێن كـوڕی خوایـە وە بۆچـونی تریـشیان هەیـە تێیـدا (پـەنای دەگـرین بـە خـوای پـەروەردگار)، بۆیـە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: من تەنها بەندەی خوام، بۆیە دەربارەی مـن بلـێن و باوەڕتان وابێت كە بەندەو پێغەمبەری خوام (ﷺ).

موسڵمانی خۆشەویست پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرامبەر بەخوای پـەروەردگار تـەنها بەندەو مرۆڤێكە وەكو سـەرجەم مرۆڤـەكانی تـر، بـەڵام بەرامبـەر بـە ئێمـە پێغەمبەرێكی (ﷺ) ڕەوانە كراوە لە لای خوای پەروەردگارەوە كە بـاوەڕ پێبـوون و شوێنكەوتن و گوێڕایەڵی كردنی و پێش خستنی فەرمانـەكانی بەسـەر فـەرمانی مرۆڤەكاندا پێویست و واجبە و نیشانەی باوەڕداری و گوێڕایەڵی كردنتە بـۆی، وە باوەڕ پێنەبوون و شوێن نەكەوتن و گوێڕایەڵی نەكردن و پـێش خـستنی فـەرمانی مرۆڤــەكانی تــر بەســەریدا نیــشانەی بــێ بــاوەڕی و ئیمــان لاوازییــە، بۆیــە خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) بەدەم نابێت بەڵكو بە زیندووكردنەوەی سـوننەت و ڕێبازەكەیەتی.

٢ ـ وە لەو بۆنانەدا چـەندین حـەرامی تـر ڕوودەدات، وەكـو: تێكـەڵ بـوونی پیاوان و ئافرەتان، وە ووتنی گۆرانی و بەكارهێنانی تـەپڵ و مۆسیقا، وە كێشانی مادده بێ هۆش كەرەكان (لە هەنـدێ لـە ووڵاتـەكان)، وە جـاری واهەیـە شـیركی

---

[١٣١] البخاري مع الفتح بنصه، كتاب الأنبياء، باب قوله تعالى: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مَرْيَمَ...﴾، ٦/٤٧٨، ١٢/١٤٤، وانظر: شرحه في الفتح ١٢/١٤٩.

گەورەی تێدا ڕوودەدات، وەکو پاڕانەوەو داوای کۆمەك و یارمەتی کردن لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، وە پاڕانەوەو داوای کۆمەك و یارمەتی کردن لە پیاوچاکان، وە سوکایەتی دەکرێت بە قورئانی پیرۆز، لە کاتێکدا جگەرە دەکێشرێت لەو شوێنەی کە قورئانی پیرۆزی تێدا دەخوێنرێت، وە گێڕانی ئەو ئاهەنگە ماڵ و پارەیەکی زۆری تێدا سەرف دەکرێت، وە تێیدا کۆڕی بە کۆمەڵی زیکر دەبەسترێت لەگەڵ چەپڵە لێدان و دەنگ هەڵبڕینێکی زۆر لە لایەن گەورەی زیکر کەرەکانەوە، وە جگە لەم کارانەش کە ناشەرعین و دروست نین بەیەك دەنگی زانایانی لەسەر حەق[١٢٢].

کردنی چەندین کاری نادروست و ناشیاو لەو ئاهەنگەدا، بۆ نمونە هەندێك لە ئامادەبووانی ئاهەنگەکە بە پێوە ڕادەوەستن لە کاتی باس کردنی لە دایك بوونی پێغەمبەردا (ﷺ) بەڕێزو گەورەییەوە، باوەڕیان وایە پێغەمبەر (ﷺ) لەو شوێنەی کە ئەو ئاهەنگەی لێ دەگێڕدرێت ئامادە دەبێت، بۆیە هەندێکیان بە پێوە ڕادەوەستن پێشوازی لێ دەکەن و بەخێر هاتنی دەکەن، بەڵام ئەو کەسە نەزان و نەفامانە نازانم بەچی بیرو هۆشێك ئەو گومانە دەبەن، ئایا نازانن کە پێغەمبەر (ﷺ) لەناو گۆڕەکەیدایە و هەتا ڕۆژی قیامەت دەرناچێت، وە پەیوەندی ناکات بە هیچ کەسێکەوە و ئامادەی هیچ کۆڕ و کۆبونەوەیەکیان نابێت، بەڵکو لەناو گۆڕەکەیدایە تا ڕۆژی دوایی، بەڵام ڕوحەکەی لە شوێنە هەرە بەرزەکانی بەهەشتە لای خوای پەروەردگار لە شوێنی ڕێزو کەرامەتدا (بەهەشت)[١٢٣]، هەروەك خوای پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿ ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ ۝١٥ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تُبْعَثُونَ ۝١٦ ﴾(المؤمنون: ١٥-١٦)

---

[١٢٢] بڕوانە: الإبداع في مضار الابتداع، للشيخ علي محفوظ، ص ٢٥١-٢٥٧.

[١٢٣] بڕوانە: التحذير من البدع، لسماحة العلامة الإمام عبد العزيز بن عبد الله ابن باز، ص١٣.

واتە: بێگومان سەرئەنجام ئێوە هەر دەبێت بمرن (لە توێی خاكدا دەبێت مەنزڵ بگرن)، پاشان دەبێت لە ڕۆژی قیامەتدا زیندوو بكرێنەوە(بۆ پاداشت و لێ پرسینەوە). وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((أَنا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ يَومَ القيامَةِ، وَأَوَّلُ مَن يَنشَقّ عَنهُ القَبرَ، وَأَوَّلُ شافِعٍ وَأَوَّلُ مُشَفعٍ))[١٢٤].

واتە: من گەورەی كوڕانی پێغەمبەر ئادەمم (عليه السلام)، وە یەكەم كەسم كە لە گۆڕەكەم دەردەچم، وە یەكەم كەسم تكا دەكەم و تكام وەرگیراوە.

ئەم ئایەتە و فەرمودە پیرۆزەكەی پێغەمبەرو (ﷺ) وە ئەو ئایەت و فەرمودانەی لەم شێوەیە هاتوون، هەموویان بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە پێغەمبەر (ﷺ) و هەموو مردووەكانی تریش لە دوا ڕۆژدا لە گۆڕەكانیان دەردەچن.

زانای پایە بەرز عبدالعزيز بن عبدالله ابن باز (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرمویەتی: (ئەمە كارێكە زانایان یەكدەنگن لەسەری (واتە: مردوو هەتا ڕۆژی دوایی لە ناو گۆڕەكەیدایە و دەرناچێت) هیچ كێشە و ڕاجیاییەك نییە لە سەری لە نێوانیاندا)[١٢٥].

**دووەم: بیدعەی ئاهەنگ گێڕان بە هاتنی یەكەم شەوی جومعە لە مانگی ڕەجەب:**

ئاهەنگ گێڕان بە هاتنی یەكەم شەوی جومعە لە مانگی ڕەجەب بیدعەیەكی خراپە و ئینكاری لێكراوە، هەروەك ئیمامی أبوبكر الطرطوشي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) باسی ئەوەی كردووە.

ئیمامی أبومحمد المقدسي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: نوێژی مانگی ڕەجەب لای ئێمە نەكراوەو ڕووی نەداوە لە (بيت المقدس) مەگەر لە ساڵی ٤٨٠

---

[١٢٤] رواه مسلم، كتاب الفضائل، باب تفضيل نبينا محمد (ﷺ) على جميع الخلائق، ١٧٨٢/٤، برقم ٢٢٧٨.

[١٢٥] بڕوانە: التحذير من البدع، ص١٤، وص٧-١٤، وە بڕوانە: الإبداع في مضار الابتداع للشيخ علي محفوظ ص٢٥٠-٢٥٨، وە بڕوانە: التبرك: أنواعه وأحكامه، للدكتور ناصر بن عبد الرحمن الجديع، ص٣٥٨-٣٧٣، وە بڕوانە: تنبيه أولي الأبصار إلى كمال الدين وما في البدع من أخطار، ص٢٢٨-٢٥٠

کۆچیدا نەبێت (واتە: لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) نەبووەو نەکراوە) وە ئێمە نە ئەو نوێژەمان بینیوەو نە بیستوشمانە لە پێشدا[١٣٦].

وە ئیمامی أبو الشامة (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: کردنی نوێژی (الرغائب) ئەوەی کە ئەمڕۆ لە ناو خەڵکیدا باوە ئەو نوێژەیە کە لە نێوان نوێژی مەغریب و عیشادا دەکرێت لە شەوی یەکەمی جومعەی مانگی ڕەجەبدا[١٣٧].

وە زانای پایە بەرز ئیمامی إبن رجب (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: (کردنی نوێژی (الرّغائب)، هیچ فەرمودەیەکی ڕاست نەهاتووە سەبارەت بە کردنی نوێژێکی تایبەت تا لە مانگی ڕەجەبدا بکرێت، وە ئەو فەرمودانەی کە گێڕدراونەتەوە سەبارەت بە نوێژی (الرّغائب) لە یەکەم شەوی جومعە لە مانگی ڕەجەبدا هەمویان درۆن و پوچەڵن و صەحیح نین، وەکردنی ئەو نوێژە بیدعەیە لای زۆربەی زانایان)[١٣٨].

وە زانای پایە بەرز إبن حجر (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرمویەتی: هیچ فەرموودەیەکی ڕاست و دروست نەهاتووە کە ببێتە بەڵگە لەسەر گەورەیی مانگی ڕەجەب، وە لەسەر بە ڕۆژوو بوون، وە تایبەت کردنی شەوێکی بۆ کردنی شەو نوێژ[١٣٩].

وە ئەم ئیمامە بەڕێزە ئەوەی ڕوون کردۆتەوە ئەو فەرموودانەی سەبارەت بە فەزڵ و گەورەیی مانگی ڕەجەب یان گرتنی ڕۆژووی مانگەکە یان چەند ڕۆژێکی هاتوون، دوو بەشن، هەندێکیان فەرمودەی لاوازن وە هەندێکیان هەڵبەستراون(كلّها ضعيفة أو موضوعة)[١٤٠].

---

[١٣٦] بڕوانە: الحوادث والبدع، لأبي بكر الطرطوشي، ص٢٦٧. برقم ٢٣٨.

[١٣٧] بڕوانە الباعث على إنكار البدع والحوادث، للإمام أبي شامه، ص١٣٨.

[١٣٨] بڕوانە: لطائف المعارف فيما لمواسم العام من الوظائف، ص٢٢٨.

[١٣٩] بڕوانە: تبيين العجب بما ورد في شهر رجب، ص٢٣.

[١٤٠] بڕوانە: تبيين العجب بما ورد في شهر رجب، ص٢٣

پاشان باسی ئەو فەرموودەیەی کردووە کە لەسەر نوێژی (الرّغائب) هاتووە، کە تیایدا هاتووە: دەبێت ڕۆژی پێنج شەمی یەکەمی مانگی ڕەجەب بە ڕۆژو بێت، وە شەوەکەی کە شەوی جومعەیە دوانزە ڕکات نوێژ بکرێت لە نێوان نوێژی مەغریب و عیشادا لە هەموو ڕکاتێکدا سورەتی فاتیحە دەخوێندرێت، وە سێ جار سورەتی ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ﴾ (القدر: ١)، وە دوانزە جار سورەتی ﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾ (الإخلاص: ١) دەخوێندرێت، وە لە نێوان هەردوو ڕکاتێکدا سەلام دەدرێتەوە، پاشان ئەم ئیمامە بەڕێزە بەدوور و درێژی باسی چۆنیەتی (سبحان الله و استغفر الله) و سوجدەبردن و چۆنیەتی سڵاوات دانی لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) کردووە، وە ئەوەی ڕوون کردۆتەوە کە فەرموودەی کردنی نوێژی (الرغائب) هاتووە، فەرموودەیەکی درۆو هەڵبەستراوە بە دەم پێغەمبەری خواوە (ﷺ)، وە ئەوەی ڕوون کردۆتەوە هەر کەسێك بیەوێت ئەو نوێژە بکات ئەوە دەبێت ڕۆژی پێنج شەممە بە ڕۆژوو بێت، هەر چەندە ئەو ڕۆژە زۆر گەرمیش بێت، وە ئەگەر ئەو ڕۆژە بە ڕۆژوو بوو ئەوە نابێت نان بخوات هەتا نوێژی مەغریب نەکات، پاشان دەکەوێتە نوێژ کردن و خوێندنی (سبحان الله)یەکی زۆروو بردنی سوجدەی دوورو درێژ، کە زۆر پێی بێ تاقەت و ماندوو دەبێت، وە ئەو نوێژ خوێنە دەڵێت: «من خۆم ڕادێنم بۆ گرتنی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان و کردنی نوێژی تەراویح، بەڵکو ئەم نوێژە لە لای کەسانی سادەو نەشارەزا زۆر گەورەترو خێرترە لە نوێژی جەماعەت، ئەوەندە خەڵك ئامادە دەبن بۆ کردنی کە بۆ نوێژی جەماعەت ئەوەندە خەڵك ئامادە نابن)[١٤١].

ئیمامی إبن الصّلاح (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەربارەی نوێژی (الرّغائب) فەرمویەتی: ئەو فەرمودەیەی کە دەربارەی خێرو گەورەیی نوێژی (الرّغائب) هاتووە،

---

(١٤١) بڕوانە: تبيين العجب كما ورد في شهر رجب، ص٤٥.

فەرمودەیەکی درۆو و هەڵبەستراوە بەدەم پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کردنی ئەم نوێژە بیدعەیەکە کە لە ساڵەکانی دوای چوارسەدی کۆچی داهێنراوە[١٤٢].

وە ئیمامی العز بن عبدالسّلام (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە ساڵی ٦٣٧کۆچیدا فەتوای داوە کە نوێژی (الرّغائب) ئەو فەرموودەیەی کە دەربارەی خێرو گەورەیی نوێژی الرّغائب هاتووە، فەرمودەیەکی درۆو و هەڵبەستراوە بەدەم پێغەمبەری خواوە (ﷺ)[١٤٣].

بۆیە موسڵمانی خۆشەویست منیش کۆتایی ئەم باسەت بۆ پوخت دەکەم بە ووتەی زانایان کە زانای پایە بەرز إبن الشّامة (ڕەحمەتی خوای لێبێت) هێناویێتی دەربارەی بەتاڵی و خراپی کردنی ئەم نوێژە، کە دەفەرموێت:

١ ـ ئەوەی کە بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی کردنی ئەم نوێژە بیدعەیە ئەوەیە: کە زانایانی ناودارو پێشەوایانی دین و موسڵمانان: لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) و شوێن کەوتوانیان و شوێن کەوتوی ئەوانیش، وە جگە لەوانیش کە چەندین کتابیان نوسیوە لە شەریعەتدا، لەگەڵ ئەوەی کە زۆر سور بوونە تا موسڵمانان فێری هەموو فەرزو سونەتەکان بکەن، لە هیچ یەکێك لەو زانایانەوە نەگێڕدراوەتەوە کە باسی ئەم نوێژەیان کردبێت، وە هیچ یەکێك لەو زانایانە نەلە کیتاب و نەلە دانیشتنەکانیاندا باسی ئەو نوێژەیان نەکردووە، وە شتێکی نەگونجاویشە کە ئەو نوێژە سوننەت بێت و شاراوە بێت لەو زانا شارەزاو تێگەیشتوانە لە شەرع.

٢ ـ ئەم نوێژە پێچەوانەی شەرعە لە سێ ڕووەوە:

**یەکەم:** کردنی ئەم نوێژە پێچەوانەی ئەو فەرمودەیەیە کە أبوهريرة لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە، کە فەرمویەتی: ((لا تَخُصُّوا لَيلَةَ

---

[١٤٢] بروانە: كتاب الباعث على إنكار البدع والحوادث، للإمام أبي شامة، ص١٤٥.

[١٤٣] بروانە: كتاب الباعث على إنكار البدع والحوادث، للإمام أبي شامة، ص ١٤٩.

الجُمُعَةِ بِقِيامٍ مِن بَينِ الليالي، وَلا تَخُصُّوا يَومَ الجُمُعَةِ بِصِيامٍ مِن بَينِ الأيَّامِ، إلاّ أن يَكونَ فِي صَومٍ يَصُومُهُ أحَدُكُم))[١٤٤].

واتە: شەوی جومعە تایبەت مەكەن بە كردنی شەو نوێژ لەناو شەوەكاندا، وە ڕۆژی جومعە تایبەت مەكەن بە گرتنی ڕۆژوو لە ناو ڕۆژەكاندا، مەگەر ئەو ڕۆژە ڕۆژێك بێت كە عادەتی بێت بیگرێت.

بۆیە دروست نییە شەوی جومعە تایبەت بكرێت بە كردنی نوێژی زیاتر لە شەوانی تر لە بەر ئەم فەرموودەیە[١٤٥] ، ئەم فەرموودەیە گشتی یە و یەكەم شەوی جومعەی مانگی ڕەجەب و جگە لەویش دەگرێتەوە.

**دووەم:** كردنی نوێژی (الرّغائِب) لە مانگی ڕەجەب و شەعبان هەردووكیان بیدعەن، چونكە هەردوكیان بە درۆ هەڵبەستراون بەدەم پێغەمبەری خواوە (ﷺ)، ئەویش بە هەڵبەستنی چەند فەرمودەیەك كە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) نین، وە درۆ هەڵبەستنە بۆ خوای پەروەردگار لە كاتێكدا ئەم نوێژەیان داناوەو پاداشتێكی گەورەیان لەسەر داناوە، بەڵام خوای پەروەردگار هیچ بەڵگەیەكی لەسەر دانەبەزاندووە، بۆیە خەمخۆری بۆ دینی خوای پەروەردگار و پێغەمبەرەكەی (ﷺ) ئەوەیە ئینكاری لەو فەرمودانە بكرێت كە بە درۆ هەڵبەستراوە بەدەم پێغەمبەری خواوە (ﷺ)، وە پشت گوێ بخرێت و بە خراپ بزانرێت و خەڵكی لێ دوور بخرێتەوە، چونكە ڕازی بوون و كردنی ئەو نوێژە چەندین خراپەی لێ دەكەوێتەوە، لەوانە:

**خراپەی یەكەم:** پشت بەستنی زۆربەی كەسانی سادەو نەزان بەو فەرموودانەی كە لەسەر خێرو گەورەیی ئەو نوێژە هاتوون، بۆیە زۆربەیان بەرەو

---

[١٤٤] متفق عليه: البخاري، كتاب الصوم، باب صوم يوم الجمعة، ٢/٣٠٣، برقم ١٩٨٥، ومسلم، كتاب الصيام، باب كراهة صوم يوم الجمعة منفرداً، ٢/٨٠١، برقم ١١٤٤.

[١٤٥] بڕوانە: كتاب الباعث على إنكار البدع، لأبي شامة، ص ١٥٦.

دوو شت دەڕۆن:

١ ـ پشت گویٚ خستن و کەم تەرخەمی کردن لە کردنی نوێژە فەرزەکاندا.

٢ ـ ڕۆ چوون لە کردنی تاواندا، پاشان چاوەڕێی هاتنی ئەو شەوە دەکەن، ئەو نوێژە دەکەن، وا دەبینن ئەو نوێژە هەموو کەم و کورییەکیان بۆ پڕ دەکاتەوە و هەرچی تاوانێك کە کردویانە دەیسڕێتەوە، بۆیە ئەوەی کە فەرموودەی نوێژی (الرَّغائِب) داناوە وای لیٚ دەکات کە زۆر عیبادەت بکات، لە هەمان کاتیشدا هانی دەدات بۆ زیاتر کردنی تاوان و خراپەکاری، چونکە گومانی وایە کردنی ئەو نوێژە دەبێتە مایەی سڕینەوەی تاوانەکانی.

**خراپەی دووەم:** کردنی بیدعە زیاتر بیدعەچی فریو دەدات بۆ سەرلێشێواندنی موسڵمانان، هەرکاتێك دەبینن بیدعەکەیان ڕەواجی هەیە و خەڵکی زۆر دەیکەن و ڕۆچوونە تیایدا، ئەوە کەسانی بیدعەچی لە کردنی بیدعەیەکەوە دەیان گوازنەوە بۆ کردنی بیدعەیەکی تر، بەڵام ئەگەر واز لە بیدعە بهێنرێت و نەکرێت ئەوە دەبێتە سەرزەنشت کردن بۆ کەسانی بیدعەچی و ئەو کەسانەی کە بیدعە دادەهێنن.

**خراپەی سێیەم:** کاتێك کەسێکی زانا (بەناو زانا) ئەو نوێژە دەکات و خەڵك دەیبینن وا دەزانن کردنی ئەو نوێژە سوننەتە، بۆیە ئەو زانایە بە زمانی حاڵی درۆ هەڵدەبەستێت بە زمانی پێغەمبەرەوە (ﷺ)، وە زمانی حاڵ جاری وا هەیە شوێنی ووتنی زمان دەگرێتەوە، بۆیە زۆربەی هەرە زۆری موسڵمانان کە تووشی بیدعە بوونە بە هۆی ئەم هۆکارەوەیە[١٤٦].

---

[١٤٦] بەڵیٚ بەڕاستی ڕاست دەکەیت ئەی زانای پایە بەرز، بەڕاستی زۆربەی موسڵمانانی ئەمڕۆ بە هۆی بیدعەو نەزانی کەسانی بە ناو زاناو شارەزا گومڕا و سەرلێشێواو بوونە و کەوتوونەتە ناو چەندین کاری حەرام و بیدعەوە، کاتێك دەوترێت ئەی موسڵمانی خۆشەویست ئەو کارەی کە تۆ دەیکەیت حەرامە، تاوانە، بیدعەیە، لادانە لە سوننەت، لە وەڵامدا پێت دەڵێت: ئەی ئەوە نییە فلان مامۆستا و

**خراپەی چوارەم:** كاتێك كەسێكی بەناو زانا ئەو نوێژە بیدعەیە دەكات هۆكارە بۆ ئەوەی كە خەڵك درۆ بە دەم پێغەمبەری خواوە (ﷺ) هەڵبەستن، دەڵێن ئەم نوێژە سوننەتێكە لە سوننەتەكانی پێغەمبەر (ﷺ).

٣ ـ كردنی ئەم نوێژە بیدعەیە چەندین پێچەوانەی تیایە بۆ سوننەتەكانی ناو نوێژ، **لەوانە:**

١ ـ ئەو نوێژە پێچەوانەیە بۆ سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە نوێژدا، بە هۆی ژمارەی ئەو سوجدەو (سبحان الله) یانە و ژمارەی خوێندنی سورەتی ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ۝١ ﴾ (القدر: ١)، وە دوانزە جار سورەتی ﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ﴾ (الإخلاص: ١) لە هەموو ڕكاتێكدا.

٢ ـ پێچەوانەیە بۆ سوننەتی خشوعی ناو دڵ و بە ئاگا بوونی لە نوێژەكەیی و تەنها دڵ پەیوەست كردن بە خوای پەروەردگارەوە لە ناو نوێژەكەیدا، وە وەستان لەسەر ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز و تێگەیشتن لێیان.

٣ ـ پێچەوانەیە بۆ سوننەتی نوێژە سوننەتەكان لەماڵەوە، چونكە كردنی نوێژە سوننەتەكان لە ماڵەوە خێرترو باشترە وەك كردنیان لە مزگەوت (مەگەر نوێژێك كردنی لە مزگەوتدا باشتر بێت وەكو: نوێژی تەراویح ....)، وە كردنی نوێژە سوننەتەكان بە تەنها باشترە وەك بە كۆمەڵ، جگە لە نوێژی تەراویح كە كردنی لە مزگەوت و بە جەماعەت باشترە.

٤ ـ ئەو كەسەی ئەو نوێژە بیدعەیەی داهێناوە لە تەواوەتی نوێژەكە ئەوەیە (لای ئەو بیدعەچی و لە خوا نەترسە) ئەو كەسەی ئەو نوێژە دەكات

---

زانا دەیكەن ئایا تۆ لەوان زیرەكترو شارەزا تری؟ كردەوەی بە ناو زاناو شارەزایانت بۆ دەكاتە بەڵگە و وازی لە چەندین فەرموودەی خوای پەروەردگار و پێغەمبەر (ﷺ) هێناوە، ئەم موسڵمانە داماوو نەشارەزایە نازانێت كە حەق و ڕاستی بە كردەوەی پیاوان ناناسرێتەوە، بەڵكو شارەزابوونی حەق كردەوەی ئەوانی پێ دەناسرێتەوە.

دەبێت ڕۆژی پێنج شەممە بە ڕۆژوو بێت، کە ئەم مەرجە دوو سوننەتی پێغەمبەری (ﷺ) لە ناو بردووە: سوننەتی زوو ڕۆژوو شکاندن و سوننەتی دڵ یەك لاکردنەوە بۆ خوای پەروەردگار (خۆت لە برسێتی و تونێتی ڕزگار بکەیت تا دڵت تەنها لای نوێژەکە بێت، بەڵام ئەو بیدعەچیەو دانەری ئەو نوێژە بە مەرجی گرتووە کە دەبێت دوای نوێژی مەغریب ڕۆژووەکە بشکێنرێت نەك پێش مەغریب).

٥ ـ لە دوای تەواو بوونی ئەو نوێژە دوو سوجدە دەبردرێت، لە کاتێکدا بردنی ئەو دوو سوجدەیە هیچ هۆیەکی نییە[١٤٧].

موسڵمانی خۆشەویست لەو بەڵگانەی کە لە پێشدا باسکران، وە ووتەی زانایان، وە بە تاڵێتی ئەو نوێژە و خراپێتی ئەو نوێژە لە چەند ڕوویەکەوە، بۆ کەسێکی خاوەن بیرو هۆش ڕوون دەبێتەوە کە نوێژی (الرّغائب) نوێژێکی داهێنراوەو بیدعەیەکی خراپە، لە ئیسلامدا نییە بەڵکو داهێنراوە.

۞ سێیەم: بیدعەی ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی شەوی (الأسراء والمعراج)

شەوی (الأسراء والمعراج) واتە: شەوڕەوی پێغەمبەر (ﷺ) بوئاسمانەکان یەکێکە لە نیشانە گەورەکانی خوای پەروەردگار لەسەر ڕاستگۆیی و گەورەیی وپلەو پایەی پێغەمبەر (ﷺ)، وە یەکێکە لەبەڵگە گەورەکان بۆ پیشاندانی گەورەیی دەسەڵاتی خوای پەروەردگار، وە نیشانەیەکە لەسەر گەورەیی و بەرزی خوای پەروەردگار بەسەر هەموو بەندەکانیەوە.

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ سُبْحَـٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَـٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَـٰتِنَآ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١﴾ ﴾ (الإسراء).

---

[١٤٧] بڕوانە: كتاب الباعث على إنكار البدع والحوادث، لأبي شامة، ص ١٥٣-١٩٦، وهـدد المفاسـد. وأوجـه البطلان تشمل صلاة الرغائب في أول جمعة من رجب، وليلة النصف من شعبان، كما صرح بذلك أبو شامه في كتابه الباعث على إنكار البدع والحوادث، ص١٧٤.

واتـە: پـاكی و بـێ گـەردی و سـتایش بـۆ ئـەو خوایـەی كەشـەوڕەوی كـرد (لەبەشێكی كەمی شەودا) بە بەندەی خۆی پێغەمبـەر (ﷺ) لەمزگـەوتی (حـرام: كەعبەی پـیرۆزەوە) بۆمزگـەوتی (الأقصى) لـە (بيت المقـدس) كـەدەورو بـەریمان پیرۆزو پڕ بەرەكەت كردوو: تابە هۆی ئەو شەوڕەویەوە هەندیك نیشانەو بەڵگـەو دەسـەڵاتداری و توانـای خۆمـانی نیـشان بـدەین، بەڕاسـتی ئەوخوایـە بیسـەرو بینایە.

وە لـــە پێغەمبـــەرەوە (ﷺ) چـــەندین فـــەرمودەی ڕاســـت و دروســـت گێڕدراوەتـــەوە: كـــە شـــەوڕەوی بـــە پێغەمبـــەر (ﷺ) كـــراو بـــەرز كرایـــەوە بـــۆ ئاسمانەكان و دەرگاكانی بۆ كرایەوە، ئەوەندە بەرز كرایەوە تا گەیشتە سەرووی حەوت ئاسمانەكانەوە، وە خوای پەروەردگار قسەی لە گەڵدا كرد هـەروەك خـۆی ویستی لێبوو، وە خـوای پـەروەردگار پێـنج نوێـژی لەسـەر فـەرز كـرد، خـوای پـەروەردگار لـە سـەرەتادا پـەنجا نوێـژی لەسـەر فـەرز كـرد، بـەڵام پێغەمبـەری خۆشەویست (ﷺ) بـەردەوام دەچـووەوە خزمـەت خـوای پـەروەردگارو داوای لـێ دەكرد تا لەسەری سوك بكات، ئەوەبوو خوای پەروەردگار كردی بە پێـنج فـەرز لە شەوو ڕۆژێكدا بەڵام لە خێـرو پاداشتدا خێـرو پاداشـتی پـەنجا نوێـژی هەیـە، لەبەر ئەوەی چاكە یەك بەدەیە، سوپاس بۆ ئەو خوایەی ئەوەندە نیعمـەتی زۆرە كە لە ژمارە نایات[148].

بۆیە ئەو شەوەی كە شەو ڕەوی تێدا كرا، بە هیچ شێوەیەك ئاهـەنگی تێـدا ناگێڕدرێت و تایبەت ناكرێت بە جۆرێك لـە جۆرەكـانی عیبـادەت، كـە ناشـەرعی بێت، **لەبەر چەند هۆیەك:**

١ ـ ئەو شەوەی كـە (الإسراء والمعراج) تیـا ڕویـدا هـیچ بەڵگەیـەكی ڕاسـت و دروست نەهاتووە گوایە ئەو شەوە لە مانگی ڕەجەبدا بووە یان نا، بەڵكو زاناكان

---

[148] بڕوانە: التحذير من البدع، للعلامة عبد العزيز بن عبد الله ابن باز، ص١٦.

بۆ چونیان جیاوازە لە دیاری کردنی ئەو شەوە:

هەندێکیان دەڵێن: ئەو شەوە دوای بوونی پێغەمبەر (ﷺ) بە پێغەمبەر (ﷺ) بە پانزە مانگ ڕوویدا، وە هەندێکیان دەڵێن: شەوڕەوییەکەی لە شەوی بیست و حەوتی مانگی ڕبیعی دووەم ساڵێك پێش کۆچکردنی بۆ مەدینە ڕوویدا، وە هەندێکیان دەڵێن: ئەو شەوە دوای بوونی پێغەمبەر (ﷺ) بە پێغەمبەر (ﷺ) بە پێنج ساڵ ڕوویدا[١٤٩]، وە هەندێکیان دەڵێن: شەوڕەوییەکەی لە شەوی بیست و حەوتی مانگی ڕبیعی یەکەمدا بوو[١٥٠].

زانای پایە بەرز أبو الشّامة (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: (دەگێڕدرێتەوە لە هەندێك لە چیرۆك گێڕەوەکان گوایە شەوڕەوییەکەی پێغەمبەر (ﷺ) لە مانگی ڕەجەبدا بووە، ئەم قسەیە لای زانایانی فەرمودەناس خۆی بۆ خۆی درۆیەکی ڕوون و ئاشکرایە)[١٥١].

زانای پایە بەرز إبن القیّم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: (شەوڕەوییەکەی پێغەمبەر (ﷺ) نازانرێت لە چی شەوێکدا بووە)[١٥٢].

وە هەروەها زانای پایە بەرز عبد العزيز بن عبد الله ابن باز (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: (ئەو شەوەی کە شەوڕەوییەکەی پێغەمبەری (ﷺ) تێدابوو هیچ فەرموودەیەکی ڕاست و دروست نەهاتووە کە دیاری بکات نەلە مانگی ڕەجەب و نەلە هیچ مانگێکی تردا، بەڵکو ئەو فەرمودانەی کە ئەو شەوەیان دیاری کردووە هیچیان صەحیح نین لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) لای زانایانی

---

[١٤٩] **بڕوانە**: شرح النووي على صحيح مسلم، ٢/٢٦٧-٢٦٨.

[١٥٠] **بڕوانە**: كتاب الحوادث والبدع، لأبي شامة، ص٢٣٢.

[١٥١] **بڕوانە**: كتاب الحوادث والبدع، لأبي شامة، ص٢٣٢، وە **بڕوانە**: تبيين العجب عما ورد في شهر رجب، لابن حجر، ص ٩، ١٩، ٥٢، ٦٤، ٦٥.

[١٥٢] **بڕوانە**: زاد المعاد في هدي خير العباد، لابن القيم، ١/٥٨.

فەرموودەناس، وە خوای پەروەردگار، وە خوای پەروەردگار زۆر داناو كار بە جێیە كاتێك دیاری كردنی ئەو شەوەی لە بیر خەڵكی بردۆتەوە، وە ئەگەر ئەو شەوە دیاریش بكرێت ئەوە دروست نییە تایبەت بكرێت بە جۆرێك لە جۆرەكانی عیبادەت بە بێبوونی بەڵگەی شەرعی)[١٥٣].

٢ ـ نەزانراوە لە هیچ یەكێك لە موسڵمانانی خاوەن زانست و باوەڕ كە ئەو شەوەی بە پیرۆزترو گەورەتر زانیبێت لە شەوەكانی تر، وە لەبەر ئەوەی نە پێغەمبەر (ﷺ) و نە هاوەڵانی و نە شوێن كەوتووان وە شوێن كەوتووی ئەوانیش، ئاهەنگیان نەگێڕاوە لەو شەوەدا وە تایبەتیان نەكردووە بە جۆرێك لە جۆرەكانی پەرستن، بۆیە ئەگەر ئاهەنگ گێڕان لەو شەوەدا كارێكی شەرعی بوایە ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ موسڵمانانی ڕوون دەكردەوە جا بە قسە بێت یان بە كردەوە، وە ئەگەر ڕوویبدایە لەسەردەمی ئەواندا ئەوا ئەو شەوە دەزانراو دەناسرا، وە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئێمەیان دەگێڕایەوە[١٥٤]

٣ ـ خوای پەروەردگار ئاینی بۆ ئەم ئوممەتە كامل و تەواو كردووە، وە نیعمەتی خۆی بەسەردا ڕژاندوون، هەروەك دەفەرموێت: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ﴿٣﴾﴾ (المائدة: ٣) .

واتە: ئەمڕۆ دینم بۆ تەواوكردن و نیعمەتی خۆم ڕژاندووە بەسەرتاندا وەڕازیم لێتان (ئەی موسوڵمانان) كە ئیسلام ئاینتان بێت و هیچ مەنهەج و ڕێباز و ئاینێكی تر نەكەنە ئاینی خۆتان.

زانای پایە بەرز إبن كثير (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرمویەتی: (ئەم نیعمەت و بەخششەی خوای پەروەردگار گەورەترین نیعمەت و

---

[١٥٣] بڕوانە: التحذير من البدع، ص١٧.

[١٥٤] بڕوانە: زاد المعاد لابن القيم، ١/٥٨، والتحذير من البدع، للعلامة ابن باز، ص١٧.

بەخشـشە بەسـەر ئـەم ئوممەتـەوە لـە کاتێکدا ئاینەکـەی بـۆ تـەواو کـردوون، پێویستیان بە هیچ ئاینێك نییە جگە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام، وە پێویستیان بـە هیچ پێغەمبەرێك (ﷺ) نییـە جگـە لـە پێغەمبـەری خۆیـان (ﷺ)، بۆیـە خـوای پـەروەردگار پێغەمبەری (ﷺ) گێڕاوە بـە دوایـن پێغەمبـەر (ﷺ)، وە ڕەوانـەی کردووە بۆ هـەموو مـرۆڤ و جنۆکـەکان، هـیچ حـەڵاڵێك نییـە مەگـەر ئـەو حـەڵاڵی کردبێت، وە هیچ حەرامێك نییە مەگەر ئەو حـەرامی کردبێـت، وە هـیچ مەنهـەج و ڕێباز و ئاینێك حەق و ڕاسـت نییـە مەگـەر ئـەو ئاینـەی کـە پێغەمبـەر (ﷺ) بـە دینـی زانیبێـت، وە هـەر شـتێك ئـەو هـەواڵی پێـدابێت حـەق و ڕاسـتە هـیچ درۆو دواکەوتنی تێدا نییە)[١٥٥].

﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ هـەم دیـن لەهـەموو ڕویەکـەوە تـەواوە و پێویستی بە زیادو کەم نییـە وە هـەم خـوای پـەروەردگار تـەواو نیعمـەتی خـۆی ڕشتووە بەسەر موسوڵمانانـدا .

وە هەروەها دەفـەرموێت: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَـٰٓؤُا۟ شَرَعُوا۟ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةُ ٱلْفَصْلِ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢١﴾﴾ (الشورى: ٢١) .

واتە: (ئایا ئەو بێباوەڕانە ڕازین بەبەرنامەی خوا؟) یان شوێنی ئـەو هـاوەڵ پەیداکەرانـە کـەوتوون کـە بـەناوی دینـەوە بەرنامـەیان بـۆ دادەنـێن و پـەیڕەوی دەکەن، بێ ئەوەی خوای پەروەردگار مۆڵەتی دابێت و پێـی ڕازی بێـت (حـەرام و حەڵاڵیان بۆ دیاری دەکەن)، خۆ ئەگەر بڕیاری پێشترمان نەبوایە تا کـاتی دیـاری کـراو، ئـەوە فـەرمانمان دەدا بەلـەناو بردنیـان، بێگومـان بـۆ بێبـاوەڕان و ستەمکاران سزای زۆر توندو بە ئێش هەیە .

---

[١٥٥] بڕوانە: تفسير القرآن العظيم للأمام إبن كثير (رحمه الله تعالى) ٢٦/٣ .

٤ ـ پێغەمبەری خوا (ﷺ) موسڵمانانی ئاگادار كردۆتەوە لە خراپی و ترساكی بیدعە، وە بەڕوون و ئاشكرا فەرموویەتی: هەموو تازەداهێنراوێك لەم دینەدا گومڕایی و سەرلێشێواوییە، وە هەر كارێك بیدعە بێت و بكرێت ئەوە بەسەر خاوەنەكەیدا دەدرێتەوە، هەروەك ئیمامی بوخاری و موسلیم (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) لە دایكی ئیماندارانەوە بۆمان دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((مَن أحدَثَ في أمرِنا هذا ما لَيسَ مِنهُ فَهُوَ رَدٌّ))[156].

واتە: هەركەسێك كارێك دابهێنێت لە دیندا و فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت بە زیادكردنی ئەو كارە ئەوە بەسەریدا دەدرێتەوەو لێی وەرناگیرێت. وە لە گێڕانەوەیەكی تردا كە ئیمامی موسلیم گێڕاوێتیەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((مَن عَمِلَ عَمَلاً لَيسَ عَلَيهِ أمرُنا فَهُوَ رَدٌّ))[157].

واتە: هەركەسێك كارێك بكات (عیبادەتێك) فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت بۆ كردنی، ئەوە ئەو كارە كارێكە وەرناگیرێت بەڵكو دەدرێتەوە بەسەر خاوەنەكەیدا.

وە زانایانی پێشینی ئەم ئوممەتە موسڵمانانیان ئاگادار كردۆتەوە لە خراپی و ترساكی بیدعە، چونكە بیدعە زیادكردنە لە دین و شەرعێكە خوای پەروەردگار فەرمانی پێ نەكردووە و ڕێگەشی پێنەداوە، وە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگەی پێنەداوە، وە لەبەر ئەوەی خۆ شوبهاندنە بە دوژمنانی دین وەكو: گاورو جولەكە، كە بیدعە وشتی زیادەیان خستە ناو دینەكەیانەوە[158].

---

[156] رواه البخاري ٣/٢٢٢، برقم ٢٦٩٧، ومسلم، ٣/٣٤٤، برقم ١٧١٨.

[157] رواه مسلم، ٣/١٣٤٣، برقم ١٧١٨

[158] بڕوانە: التحذير من البدع، لابن باز، ص١٩.

**چوارەم: ئاهەنگ بە بۆنەی هاتنی شەوی پانزەی مانگی شەعبان:**

ئیمامی پایە بەرز محمدی کوڕی وضاح القرطبي لە عبدالرحمن کوڕی زیـدي کوڕی أسـلم دەگێڕێتـەوە کـە فەرمویـەتی: ئـەم بیـستووە لـە هـیچ یـەکێك لـە زانـاو شـارەزایانمان کـە گرنگـی بـدەن بـە شـەوی پـانزەی مـانگی شـەعبان، وە ئـەم بیستووە لە هیچ یـەکێکیان فەرمودەکـەی ئیمـامی مکحـول بـاس بکـەن[159]، وە هیچ یەکێکیان فەزڵی ئەو شەوەیان نەداوە بەسەر شەوەکانی تردا[160].

ئیمامی أبو بکر الطرطوشي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرمـوێت: أبـو محمـد المقدسـي (ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت) بـۆی گێڕامـەوە، فـەرموی: (لای ئێمـە بـە هـیچ شێوەیەك نوێژی (الرّغائب) نەبوو، ئەو نوێژەی کە لە مانگی ڕەجەب و شـەعباندا دەکرێت، یەکەم جار ئـەم نوێـژە لای ئێمـە داهێنـرا لـە سـاڵی ٤٤٨کۆچیدا بـوو، ئەوەبوو جارێکیان پیاوێك کە (ابن أبي الحمراء)ی پێ دەوتـرا خـەڵکی (نابلس) بـوو هات بۆلامـان لـە (بيت المقـدس)، دەنگـی زۆر خـۆش بـوو بـۆ قورئـان خوێنـدن، هەستاو لە ناو مزگەوتی (الأقصى)دا لـە شـەوی پـانزەی مـانگی شـەعباندا کەوتـە نوێژ کردن، پیاوێك لـە پـشتیەوە وەستا پاشـان دووان و پاشـان سـیان و چـوار،

---

[159] يعني بحديث مكحول ما أخرجه ابن أبي عاصم في السنة بـرقم ٥١٢، وابـن حبـان بـرقم ٥٦٦٥ [٤٨١/١٢]، والطبراني في الكبير ١٠٩/٢٠، برقم ٢١٥، وأبو نعيم في الحلية، ١٩١/٥، والبيهقي في شعب الإيمان، ٢٧٢/٥ برقم ٦٦٢٨، عن معاذ بن جبل ﷺ يرفعه: "يطلع الله إلى خلقه في ليلة النصف من شـعبان فيغفر لجميع خلقه إلا لمشرك أو مشاحن"، قال الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة: حديث صحيح روي عن جماعة من الصحابة من طرق مختلفة يشد بعضها بعضاً، وهم: معاذ بن جبل، وأبو ثعلبة الخشني، وعبـد الله بن عمرو، وأبي موسى الأشعري، وأبي هريرة، وأبي بكر الصديق، وعوف بن مالك، وعائشة رضـي الله عنهم، ثم خرج هذه الطرق الثمانية، وتكلم على رجالها في أربع صفحات.

قلت: فإن صح هذا الحديث في فضل ليلة النصف من شعبان كما يقول الألباني حفظه الله فليس فيه مـا يدل على تخصيص ليلتها بقيام ولا يومها بصيام، إلا ما كان يعتاده المسلم من العبادات المـشروعة في أيـام السّنة، لأن العبادات توقيفية.

[160] بڕوانە: كتاب فيه ما جاء في البدع، للإمام ابن وضاح، المتوفى سنة ٢٨٧هـ ص١٠٠، برقم ١١٩.

نوێژەكەی تەواو نەكرد تا كۆمەڵێكی زۆر لە پشتیەوە نوێژیان دەكرد، پاشان ساڵی دوای هاتەوە خەڵكێكی زۆر لە پشتیەوە نوێژیان دەكرد، وە لە ساڵی دواتر هاتەوە بە هەمان شێوە كۆمەڵێكی زۆرتر نوێژیان لە پشتەوە كرد و لە ناو مزگەوتدا بڵاو بووەوە، هەر بۆیە لەو ڕۆژەوە تایبەت كردنی نوێژ لەو شەوەدا بڵاو بووەوە و پەرەی سەند لە مزگەوتی (الأقصى) و ناوماڵەكان، وە جێگیر بوو وەكو نوێژێكی سوننەت هەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان)[١٦١].

وە ئیمامی ابن وضاح لە ابن أبي مليكةوە دەیگێڕێتەوە، بە ابن أبي مليكة ووترا: زياد النميري دەڵێت: شەوی پانزەی مانگی شەعبان خێرو پاداشتی بە وێنەی خێرو پاداشتی شەوی قەدرە (ليلة القدر)، ابن أبي مليكة فەرموی: ئەگەر گوێم لە خۆی بوایە كەوا دەڵێت، لەو كاتەدا دارێكم بەدەستەوە بوایە، لێیم دەدا بەو دارە، لەو كاتەدا زياد النميري قازیش بوو[١٦٢].

زانای پایە بەرز أبو الشامة (ڕەحمەتی خوای لێبێت) كە شافیعی مەزهەبە دەفەرموێت: (صلاة الألفية، ئەو نوێژەیە كە لە شەوی پانزەی مانگی شەعباندا دەكرێت، بەم نوێژە دەوترێت هەزارییە لەبەر ئەوەی هەزار جار ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ (الإخلاص ١) تێدا دەخوێندرێت، چونكە سەد ڕكاتەو لە هەر ڕكاتێكدا یەكجار سورەتی فاتیحەو دەجار سورەتی ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ دەخوێندرێت، نوێژێكی زۆر درێژو زۆر قورس و گرانە، لە كاتێكدا هیچ فەرمودەیەكی صەحیحی لەسەر نییە، بەڵكو ئەو فەرموودانەی كەلەسەری هاتوون هەمویان لاوازن یان هەڵبەستراون، هەر بۆیە بە هۆی بەردەوام بوون

[١٦١] بڕوانە: كتاب الحوادث والبدع، لطرطوشي، المتوفى سنة ٤٧٤هـ، ص٢٦٦، برقم ٢٣٨.

[١٦٢] بڕوانە: كتاب فيه ما جاء في البدع، لابن وضاح، ص١٠١، برقم ١٢٠، ورواه الطرطوشي في كتاب الحوادث والبدع عن ابن وضاح، ص٢٦٣، برقم ٢٣٥.

لەسەر کردنی ئەو نوێژە زیاتر پەرەی سەندووە لە ناو زۆربەی مزگەوتەکانی وڵاتدا، کە ئەو نوێژەی تیا دەکرێت و ئەو شەوە تا بەیانی بەردەوام دەبن، وە چەندین خراپەو تاوانکاری تیادا دەکرێت، وە پیاوان و ئافرەتان تێکەڵ دەبن، وە ئەوەندە خراپەی تری تیا دەکرێت لەبەر دیاری و ئاشکراییان پێویست بە باس کردن ناکات، وە زۆربەی نەزان و نەشارەزایان باوەڕێکی پتەویان هەیە بەم نوێژە، وە شەیتان بۆی ڕازاندونەتەوەو کردوویەتی بە بنچینەیەکی گەورەی دین)[١٦٢].

وە زانای پایە بەرز إبن رجب (ڕەحمەتی خوای لێبێت) پاش ووتەیەکی بە نرخ فەرمویەتی: (شەوی پانزەی مانگی شەعبان هەندێك لە تابعینی وەکو: خالدی کوڕی معدان، ومکحول، ولقمان کوڕی عامرو جگە لەوانیش، بە گەورەو پڕ لە خێریان دەزانی و عیبادەتی زۆریان تیا دەکرد، تا خەڵکی فەزڵ و گەورەیی ئەو شەوەیان لێیانەوە وەرگرت، دەووترێت: هەندێ بۆچوون و شوێنەواری ئیسرائیلیان پێ گەیشتبوو بۆ بە گەورە زانینی ئەو شەوە، کاتێك ئەوە ئاشکرا بوو لەناو وڵاتدا جیاوازی کەوتە نێوانیان؟ ئایا ئەو شەوە بە گەورە و پڕ لە خێر بزانرێت یان نا؟ ئەوەبوو کۆمەڵێك لە خواپەرستانی بەصرە و جگە لەوانیش ڕازی بوون پێی و بە گەورەیان زانی، بەڵام زۆربەی زاناو شارەزایانی حِجاز وەکو: عطاء، وابن أبي مليكه ئینکاریان لێ کرد، هەروەك عبد الرحمن کوڕی زید کوڕی أسلم لە زاناو تێگەیشتوانی مەدینە گێڕاوێتیەوە، وە ئەمە ووتەی هاوەڵانی ئیمامی مالك و جگە لەوانیشە، وە هەموویان فەرموویانە زیندوو کردنەوەی ئەو شەوە بە عیبادەتێکی تایبەت و جیاواز و خوێندنی ئەو هەموو زیکرو ویردانە بیدعەیە و کارێکی تازە داهێنراوە).

---

[١٦٢] بڕوانە: كتاب الباعث على إنكار البدع والحوادث، لعبد الرحمن بن إسماعيل المعروف بأبي شامة، المتوفى سنة ٦٦٥هـ، ص١٢٤.

**زانايانى شام بۆچونيان جياوازە سەبارەت بە زيندوو كرنەوەى ئەو شەوە، لەسەر دوو بۆچون:**

**يەكـەم:** زينـدوو كردنـەوەى ئـەو شـەوە سـوننەتە بـە جەماعـەت لـە مزگەوتەكاندا، هەر بۆيە خالدي كوڕى معدان و لقماني كوڕى عامرو جگە لەوانيش، لەو شەوەدا جوانترين جليان لەبەر دەكردوو بۆنى خۆشيان لە خۆيان دەدا و كليان لە چاويان دەكرد، ئەو شەوە تا بەيانى لە مزگەوتدا دەمانەوە و نوێژيان دەكرد، وە ئيمامى إسحاق بن راهويـە هـەمان بۆچـونى هـەبووە، وە دەيـووت: كردنى لە مزگەوت بيدعە نييە، هەروەك ئيمامى حَرب الكرماني لێى گێڕاوەتەوە.

**دووەم:** باش نييەو دروست نييە كۆبونەوە لە مزگەوتەكاندا بۆ نوێژ كردن و پاڕانەوە و چيرۆك گێڕانەوە، بەڵام هيچى تێدا نييە ئەگەر كەسێك تەنها بۆ خۆى نوێژ بكات، ئەمە بۆچوونى ئيمامى الأوزاعي يە، كە ئيمام و پێشەواو زاناى شام بووە، ئەم بۆچوونە نزيك ترە لە حەقەوە (إن شاء الله)، پاشان فەرموويەتى: بۆچوونى ئيمامى أحمـد نـەزانراوە دەربـارەى شـەوى پـانزەى مـانگى شـەعبان، بـەڵام سـەبارەت بـە سوننەتێتى شەو نوێژ كردن لەو شەوەدا دوو ڕيوايەتى لێوە گێڕدراوەتـەوە، يـەك لەو ڕيوايەتانەى كە لێى گێڕدراوەتەوە سەبارەت بە شەو نوێـژ كـردن لـە شـەوى جەژنـدا، لـە ڕيوايەتێكـدا شـەو نوێـژ كـردن بـە جەماعـەت تيايـدا بـە سـوننەتى نەزانيوە، لە بەرئـەوەى لـە پێغەمبـەرى خـواوە (ﷺ) نـەهاتووەو گێڕدراوەتـەوە، بەڵام لە ڕيوايەتێكدا بە سوننەتى زانيوە لە بەر ئەوەى عبد الرحمن كـوڕى زيـدي كوڕى الأسود كە يەكێكە لە تابعين ئەو شەوەى زيندوو كردۆتـەوە بـە شـەو نوێـژ كردن، بەهەمان شێوە تايبەت كردنى شەوى پانزەى مانگى شەعبان بە شەو نوێژ هيچ فەرمودەيەكى صەحيح لە پێغەمبـەر (ﷺ) و هاوەڵانيـەوە نـەهاتووە، بـەڵكو ئەوەى هاتبێت تەنها لەلايەن كۆمەڵێ تابعينى شارەزايانى شامەوە هاتووە[١٦٤].

---

[١٦٤] بڕوانە: لطائف المعارف، لابن رجب، ص٢٦٣.

زانای پایه بەرز إبن باز (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرمویەتی: (ئەو بۆچوونەی کە ئیمامی الأوزاعي بە پەسەندی زانیوە گوایە شەوی پانزەی مانگی شەعبان بە شەو نوێژ زیندوو بکرێتەوە بە تەنها، وە پەسەند کردنی ئەو بۆچونە لە لایەن إبن رجبەوە شتێکی زۆر سەیرە و بۆچونێکی لاوازە، لەبەر ئەوەی هەر کارێك ئەگەر دروستێتی و شەرعێتی بە بەڵگەی شەرعی دانەمەزرێت ئەوە بۆ هیچ موسوڵمانێك دروست نییە بیهێنێتە ناو دینەوە، جا بە تەنها بیکات یان بە جەماعەت، بە نهێنی بیکات یان بە ئاشکرا، لەبەر گشتی فەرمودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرمویەتی: ((مَن عَمِلَ عَمَلاً لَيسَ عَلَيهِ أمرُنا فَهُوَ رَدّ))[165] واتە: هەرکەسێك کارێك بکات (عیبادەتێك) فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت بۆ کردنی، ئەوە ئەو کارە کارێکە وەرناگیرێت، بەڵکو دەدرێتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا، وە جگە لەم بەڵگانەش کە بەڵگەن لەسەر نکۆڵی کردنی بیدعەو ترسان لێی[166].

موسڵمانی خۆشەویست ئەوەی کە لە پێشدا باس کرا لە ووتە بە نرخەکانی زانا بەڕێزەکانی وەکو: إبن وضاح، والإمام الطرطوشي، والإمام عبد الرحمن بن إسماعيل المعروف بأبي شامة، والحافظ ابن رجب (ڕەحمەتی خوایان لێبێت)، وە ئیمامی ئەم سەدەیە عبد العزيز إبن باز (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، بە ڕوون و ئاشکرایی بۆمان دەرکەوت کە تایبەت کردنی شەوی پانزەی مانگی شەعبان بە شەو نوێژ یان هەر عیبادەتێکی تر دروست نییە، بەڵکو بیدعەیەو هیچ بەڵگەیەکی قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەری (ﷺ) لەسەر نییە، وە هیچ یەکێك لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) نەیان کردووە.

---

[165] رواه مسلم، ١٣٤٣/٣، برقم ١٧١٨.

[166] بڕوانە: التحذير من البدع، ص٢٦.

## ۞ پێنجەم: التبرك

التَّبرّك: واتە: داواكردنی خێرو بەرەكەت، والتَّبرّك بالشَّيء: واتە: داوای خێرو بەرەكەت كردن بە هۆی شتێكەوە[١٦٧].

ئەوەی كە گومانی تیا نییە ئەوەیە كە خێرو بەخشش هەمووی بە دەست خوای پەروەردگارە، خوای پەروەردگار هەندێك لە دروستكراوەكانی خۆی تایبەت كردووە بە پڕ خێرو بەرەكەت، ووشەی البركة: لە بنەڕەتدا بە مانای جێگیرو بەردەوام دێت، وە بە مانای زیادكردن و گەشەكردنیش دێت، دەوترێت: برّك عليه، واتە: دوعای خێرو بەرەكەتی بۆ كرد، وە دەوترێت: بارك الله الشيء وبارك فيه أو بارك عليه: واتە: خوای پەروەردگار پڕ خێرو بەرەكەتی بكات، بۆیە وشەی (تبارك: خاوەنی زۆر خێرو بەرەكەت) هیچ كەسێكی پێ وەسف ناكرێت جگە لە خوای پەروەردگار، بۆیە ناوترێت: تبارك فلان، لەبەر ئەوەی واتەی: زۆرو گەورە دەگەیەنێت، بۆیە وەسفێكە بۆ هیچ كەس بەكار نایات جگە لە خوای پەروەردگار، وە ووشەی (اليُمنُ) بە مانای: پڕ خێرو بەرەكەت دێت.

ووشەی (البركة) لە قورئانی پیرۆزدا بە چەند مانایەك هاتووە، لەوانە:

١ ـ جێگیر بوون و بەردەوام بوونی خێرو بەرەكەت.

٢ ـ زۆری و زیاد بوون و بەردەوام خێرو بەرەكەتی شت لە دوای شت.

٣ ـ وشەی (تَبارَك) هیچ كەسێكی پێ وەسف ناكرێت جگە لە خوای پەروەردگار، وە نادرێتە پاڵ هیچ كەس جگە لەو، زانای پایە بەرز إبن القيّم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: (گەورەیی و زۆری خێرو بەرەكەتی خوای پەروەردگار لەوەدایە كە: بەخشندەیی بەردەوامە، خێرو بەرەكەتی زۆرە، خاوەن ڕێزو بەرزی بەردەوامە، وە خاوەنی گەورەییەو دوورە لە هەموو كەم و

---

[١٦٧] بڕوانە: النهاية في غريب الحديث، لابن الأثير، باب الباء مع الراء، مادة "برك"، ١/١٢٠، وە بڕوانە: التبرك: أنواعه وأحكامه، للدكتور ناصر الجديع، ص٣٠.

کورپییەك، هەرچی خێرو بەرەکەت هەیە لە لایەن خوای پەروەردگارەوەیە، وە خوای پەروەردگار خێرو بەرەکەتی خۆی دەڕێژێت بەسەر هەر یەکێك لە بەندەکانی کە خۆی ویستی لێیە، ئا ئەمەیە واتاکانی (تـبارك) کە لە قورئانی پیرۆزدا بە چەند مانایەك هاتووە)[١٦٨].

## ۞ ئەو شتانەی کە زۆر پیرۆزو پڕ لە خێرو بەرەکەتن:

١ - قورئانی پیرۆزی پڕ لە خێرو بەرەکەت: قورئانی پیرۆز خێرو بەرەکەتی دونیاو دواڕۆژی تێدایە، بۆیە داواکردنی بەرەکەتی قورئانی پیرۆز بە جوان خوێندنەوەو کار پێ کردنی دەبێت (بەو شێوەیەی کە خوای پەروەردگار پێی ڕازی دەبێت).

٢ - پێغەمبەری (ﷺ) پڕ لە خێرو بەرەکەت: خوای پەروەردگار خێرو بەرەکەتی گێڕاوە لە خودی پێغەمبەردا (ﷺ)، **ئەو خێرو بەرەکەتەش دوو جۆرە:**

**یەکەم:** بەرەکەتی واتایی، ئەو بەرەکەت و نیعمەتەیە کە لە دونیا و دواڕۆژدا دێتەدی بە هۆی پەیامەکەیەوە (قورئانی پیرۆز و سوننەت)، لە بەر ئەوەی خوای پەروەردگار پێغەمبەری (ﷺ) ناردووە، وەکو: ڕەحمەتێك بۆ هەموو بونەوەران، وە خەڵکی دەربکات لە تاریکییەکان بۆ ڕوناکی باوەڕو خواپەرستی، وە ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) شتە حەڵاڵ و حەرامەکانیان بۆ دیاری بکات، وە خوای پەروەردگار گێڕاوێتی بە کۆتا پێغەمبەر (ﷺ)، وە ئاینەکەی بار سووکی و نەرم و نیانی و لێبوردەیی لە خۆ گرتووە.

**دووەم:** خێرو بەرەکەتە هەست پێکراوەکانی، ئەمەش دوو جۆرە:

٣ - بوونی خێرو بەرەکەت لە کردارەکانیدا (ﷺ)، ئەویش بریتییە لەو موعجیزانەی کە خوای پەروەردگار پێی بەخشیوە و ڕێزداری کردووە پێی، وە

---

[١٦٨] بڕوانە: جلاء الإفهام ص١٨٠، وتيسير الكريم الرحمن في تفسيره كلام المنان، للسعدي، ٣/٣٩.

بەڵگەیە لەسەر ڕاستگۆییەکەی (ﷺ).

٤ ـ بوونی خێرو بەرەکەت لە خودی پێغەمبەر (ﷺ) و شوێنەوارە هەستپێکراوەکانی، ئەو خێرو بەرەکەتەیە کە خوای پەروەردگار گێڕاوێتی لە خودی پێغەمبەردا (ﷺ)، هەر بۆیە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەریان (ﷺ) بە پیرۆزو پڕ لە خێرو بەرەکەت دەزانی تا لە ژیاندا بوو، وە پاش مردنی ئەو شتانەی کە لە لاشەی بەجێ مابوو بە پیرۆزو پڕ لە خێرو بەرەکەتیان دەزانی.

بۆیە هیچ کەسێك لە دروست کراوەکانی خوای پەروەردگار پێوانە ناکرێتە سەر پێغەمبەر (ﷺ) تا بە پیرۆزو پڕ لە خێرو بەرەکەت بزانرێت، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار ئەو هەموو ڕێزو خێرو بەرەکەتەی گێڕاوە لە خودی پێغەمبەردا (ﷺ)، وە گومان لەوەدا نییە کە خوای پەروەردگار پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و فریشتەکان و پیاوچاکانی پیرۆزو پڕ خێرو بەرەکەتدار کردووە، بەڵام موسوڵمان نابێت داوای بەرەکەتیان لێ بکات، لەبەر ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی شەرعی لەسەر نییە، وەهەروەها چەندین شوێن هەیە کە خوای پەروەردگار پیرۆزو پڕ خێرو بەرەکەتداری کردوون، وەکو: مزگەوتی حرام (کەعبەی پیرۆز) و مزگەوتی مەدینە (مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) و مزگەوتی الأقصى (بيت المقدس)، وە هەروەها چەند کاتێکی پیرۆزو پڕ خێرو بەرەکەتدار کردووە، وەکو: مانگی ڕەمەزان و شەوی قەدرو دەڕۆژی یەکەمی مانگی دو الحجة وە (أشهر الحرام " مانگی: رجب، ذو القعدة، وذو الحجة، والمحرم") وە ڕۆژانی دووشەممەو پێنج شەممەو هەینی، وە کاتی دابەزینی خوای پەروەردگار لە سێ یەکی شەودا بۆ ئاسمانی دونیا، وە جگە لەم شوێنە پیرۆزانە، کە نابێت موسوڵمان تەبەڕوکیان پێ بکات و داوای بەرەکەتیان لێ بکات، بەڵکو داوای خێرو بەرەکەت هەر لە

خـوای پـەروەردگار دەکرێـت ئـەویش بـە کردنـی کـردەوە شـەرعیە چـاکەکان دەبێت[١٦٩].

٥ ـ هەندێ شت هەیە کە پیرۆزو پڕ خێرو بەرەکەتن، وەکو: ئاوی زەمزەم و باران، لە بەر ئەوەی لە بەرەکەت و خێری ئەمانە ئەوەیە: خەڵکی و ئاژەڵان لێـی دەخۆنەوە، دارو درەخت و گژوگیای پێ سەوز دەبێت، وە داری زەیتـون پـیرۆزو پـڕ خێـرو بەرەکەتـە، وە شـیرو ئەسـپ و مـەڕو دارخورمـا پـیرۆزو پـڕ خێـرو بەرەکەتن[١٧٠].

## ۞ بەدەست هێنان و داوا کردنی خێرو بەرەکەت بە ڕێگەیەکی شەرعی بەم چەند کارە دەبێت:

١ ـ بەدەست هێنـان و داوا کردنـی خێـرو بەرەکـەت بـە زیکـرو یـادی خـوای پەروەردگار و خوێندنی قورئانی پـیرۆز بەدەسـت دێـت، ئـەویش داوای بەرەکـەت کردنە لە خوای پـەروەردگار بـە زیکـری دڵ و زمـان، وە کـار کردنـە بـە قورئـانی پـیرۆز و سـوننەت بـە شـێوەیەکی شـەرعی، لەبـەر ئـەوەی بەرەکـەتیان لـەم شتانەدایە: دڵ پێیان ئارام دەبێت، دڵ بەهێز دەکەن بۆ زیاد عیبادەت کردن، وە شـیفای هـەموو دەردوو بەڵایـەکیان تێدایـە، وە بەختـەوەری دونیـاو دواڕۆژیـان تێدایە، لێخۆش بوونی تاوانـەکانی تێدایـە، بـە هۆیانـەوە هێمنـی دادەبـەزێت، وە قورئانی پیرۆز دەبێتە تکاکار بۆ خاوەنەکەی لە ڕۆژی دواییدا، بەڵام تەبەڕوك بە قورئان ناکرێت وەك دانانی لە ناو مـاڵ و نـاو سـەیارە و دانـانی لـە پـشت سـەری ئافرەتی زەیستان، بەڵکو بەدەست هێنان و داوا کردنی خێرو بەرەکەتی قورئـانی پیرۆز بە خوێندنەوەو کار پێ کردنی ئەبێت.

---

[١٦٩] بڕوانە: التبرك: أنواعه وأحكامه، للدكتور ناصر الجديع، ص٧٠-١٨٢.

[١٧٠] بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ص ١٨٣-١٩٧.

٢ ـ بەدەست هێنان و داوا كردنی خێرو بەرەكەت بە خودی پێغەمبەر (ﷺ) تا لە ژیاندا بووە، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) پیرۆزو پڕ خێرو بەرەكەت بووە لە خودی خۆی و ئەو شتانەی كە پێوەی بووە، هەربۆیە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) تەبەرروكیان دەكرد بە خودی پێغەمبەر (ﷺ) خۆی، هەروەك أبو جحيفة (ﷺ) دەفەرمووێت: ((جارێكیان پێغەمبەر (ﷺ) لە گەرمای نیوەڕدا چوو بۆ البطحآء (شوێنێكە لە نێوان مەككەو مِنیٰ) لەوێ دەست نوێژی گرت و نوێژی نیوەڕۆ و عەسری بە (قصر و جمع كرد، دوو ڕكات، دوو ڕكات) پاشان موسوڵمانان هەستان و دەستی پێغەمبەریان (ﷺ) بەدەم وچاویاندا دەهێنا (وەكو داوا كردنی خێرو بەرەكەت)، منیش دەستی پێغەمبەرم (ﷺ) گرت و بەسەر دەم و چاومدا هێنام، دەستەكانی وەكو بەفر ساردو فێنك بوون، وە بۆنی لە میسك خۆشتر بوو))[171].

وە أنس‌ی كوڕی مالك (ﷺ) دەفەرموێت: ((پێغەمبەر (ﷺ) چووە مِنیٰ و بەرد هاویشتنی (الجمرة العقبة)ی كردو چووە ناو (خێمە یان ئەو كەپرەی كە هەڵی دابوو) وە حەیوانی سەربڕی، پاشان بەسەرتاشێكی فەرموو: وەرە سەرم بتاشە، ئاماژەی بۆلای ڕاستی كردوو پاشان بۆ لای چەپی، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) مووی سەری دا بە هاوەڵە بەڕێزەكانی))، لە ڕیوایەتێكی تردا: ((پێغەمبەر (ﷺ) بانگی أبوطلحةی كردوو موەكانی لای ڕاستی سەری داپێی، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) بە سەرتاشەكەی فەرموو: لای چەپی سەرم بتاشە، ئەوە بوو موەكانی سەری دا بە أبو طلحة و پێی فەرموو: دابەشی بكە لە نێوان موسوڵماناندا" سەیركردنی بە چاوی ڕێزو پڕ خێرو بەرەكەتەوە"))[172].

---

[171] البخاري: كتاب المناقب، باب صفة النبي ﷺ ، ٤/٢٠٠، برقم ٣٥٥٣.

[172] رواه مسلم، كتاب الحج، باب بيان أن السنة يوم النحر أن يرمي، ثم ينحر، ثم يحلق، والابتداء في الحلق بالجانب الأيمن من رأس المحلوق، ٢/٩٤٧، برقم ١٣٠٥.

بۆیـه هـاوەڵانی بـەڕێزی پێغەمبـەر (ﷺ) تەبـەڕڕوکیان دەکـرد بـە جـل و بەرگەکەی و شوێنی دەستی و ئاوی دەست نوێژو بەرماوەی ئـاو خواردنەوەکـەی و زۆر شتی تر[١٧٣]، وە تەبەڕڕوکیان دەکرد بـەو شـتانەی لـە لاشـەی پێغەمبـەر (ﷺ) بووەتەوە، وەکو: مووەکانی، وە ئەو شـتانەی کـە پێغەمبـەر (ﷺ) بـەکاری هێناوەو پاش خۆی مابووەوە، وەکو: جل و بەرگ و قاپ و قاچـاغ و نەعلـەکانی، وە جگە لەم شتانەش[١٧٤].

موسوڵمانی خۆشەویست لێرەدا دەبێت ئاگاداری ئەوە بین کە هـیچ کەسـێك قیاس ناکرێتـە سـەر پێغەمبـەر (ﷺ) لـە ڕووی پـیرۆزی و پڕخێـرو بەرەکەتیـەوە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی نەکردووە کە هیچ یەکێك لـە هـاوەڵانی بـە چـاوی بەرەکەتەوە سەیر بکرێت، وە نەگێڕدراوەتەوە لە هیچ یەکێك لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) ئەو کارەیان کردبێت لە گەڵ کەسـانی جگـە لـە پێغەمبـەردا (ﷺ) جا لە ژیانیدا بێت یان دوای مردنی، وە تەبەڕڕوکیان نەکردووە بە هیچ یـەکێك لـە خەلیفە بەڕێزو صەحابەکانی پشتیوانان و کۆچـکردووان و ئەوانـەی کـە مـوژدەی بەهەشتیان پێ درابوو (خوای گەورە لە هەموویان ڕازی بێت).

زانای پایە بەرز ئیمـامی الشاطبي (ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت) دەفـەرموێت: (پـاش مردنـی پێغەمبـەر (ﷺ) هـاوەڵانی بـەڕێزی، هـیچ کارێـك ڕووی نـەداوە لێیـان دەربارەی تەبەڕڕوك کردن بە کەسانی جگە لەو، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە دوای خۆی هیچ کەسێکی بەجێ نەهێشتووە لە ئیمـامی أبوبکر الـصّدیق (ﷺ) بەڕێز تر بێـت و خەلیفەشـی بێـت، لـە نـاو هاوەڵـە بەڕێزەکانیـدا هـیچ یـەکێکیان ئەوەیان نەکرد بەرامبەری، وە ئیمامی عُمَر (ﷺ) کە دوای أبوبکر الـصدیق (ﷺ) لەو بەڕێزتر نەبووە، پاشان ئیمامی عثمان (ﷺ) و ئیمـامی علي (ﷺ) و سـەرجەم

---

[١٧٣] بڕوانە: التبرك، أنواعه وأحكامه، للدكتور الجديع، ص ٢٤٨-٢٥٠.

[١٧٤] بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ص ٢٥٢-٢٦٠.

صەحابەکان کە لە ناو ئوممەتەدا لەوان چاکترو بەڕێز تری تیا نەبووە لای خوای پەروەردگار، بە هیچ شێوەیەك بۆمان نەگێڕدراوەتەوە کە خاوەن خێرو بەرەکت بوو بێتن و خەڵکیان خێردارو بەرەکەتدار کردبێت)[١٧٥].

گومانی تێدانییە کە سوود وەرگرتن لە عیلم و زانیاری زانایان، گوێ گرتن لە ئامۆژگارییەکانیان، پاڕانەوەکانیان بۆ موسوڵمانان، دەست کەوتنی فەزڵی دانیشتگاکانیان بە دانیشتن لەگەڵیاندا پڕە لە خێرو بەرەکەت سودی زۆر، بەڵام تەبەڕروك ناکرێت بە خودی خۆیان، بەڵکو بەدەست هێنان و داوا کردنی خێرو بەرەکەت بەوە دەبێت کە کردەوەی چاکە بکەین بە عیلم و زانیاریەکەیان، وە شوێنی زانایانی ئەهلی سوننەو جەماعە بکەوین[١٧٦].

٣ ـ بەدەست هێنانی خێرو بەرەکەت بە خواردنەوەی ئاوی زەمزەم، چونکە ئاوی زەمزەم پیرۆزترین ئاوی سەر زەوییە، بە خواردنەوەی تینوێتی دەشکێت و شوێنی خواردنیش دەگرێت، وە خواردنەوەی بە نییەتێکی باش شیفای تێدایە، لەبەر ئەوەی بۆ هەر مەبەستێك بخورێتەوە دێتە دی، پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی ئاوی زەمزەم دەفەرمووێت: ((إنَّها مُبارَكَةٌ، إنَّها طَعامُ طُعمٍ [وَشِفاءُ سَقِيم]))[١٧٧] واتە: بەڕاستی ئاوی زمزم ئاوێکی پیرۆز و پڕ بەرەکەتە، ئاوێکە شوێنی خواردن دەگرێتەوە، وە شیفای نەخۆشی تێدایە.

جابری کوڕی عبدالله فەرمودەیەکمان بۆ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((ماء زمزم لما شرب له))[١٧٨].

---

[١٧٥] بڕوانە: الاعتصام للشاطبي ٢/٨، ٩، وە بڕوانە: التبرك: أنواعه وأحكامه، للدكتور الجديع، ص ٢٦١-٢٦٩.

[١٧٦] بڕوانە: التبرك أنواعه وأحكامه، للدكتور الجديع، ص ٢٦٩-٢٧٨.

[١٧٧] أخرجه مسلم، كتاب فضائل الصحابة، باب من فضائل أبي ذر ﷺ، ١٩٢٢/٤، برقم ٢٤٧٣، وما بين المعكوفين عند البزار، والبيهقي، والطبراني، قال الهيثمي في مجمع الزوائد: "رجاله ثقات"، ٢٨٦/٣.

[١٧٨] أخرجه ابن ماجه، كتاب المناسك، باب الشرب من زمزم، ١٠١٨/٢، برقم ٣٠٦٢، وصححه الألباني في صحيح سنن ابن ماجه، ١٨٣/٢، وإرواء الغليل، ٣٢٠/٤.

واته: ئاوی زەمزەم بۆ هەر مەبەستێك بخورێتەوە دێتە دی.

وە گێڕدراوەتەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) ئاوی زەمزەمی دەكردە ناو كوپە و دۆلكەوە دەیدا بە نەخۆشەكان و دەیكرد بەسەریاندا[١٧٩] (رووومەتیانی پێ تەڕ دەكرد).

٤ ـ بەدەست هێنانی خێرو بەرەكەت بە ئاوی باران، گومانی تێدا نییە كە ئاوی باران پیرۆز و پڕ بەرەكەتە، چونكە خوای پەروەردگار بەرەكەتی تێ كردوو: خەڵكی لێی دەخۆنەوە، وە هەموو گیان لەبەران و ڕووەك و درەخت و بەروبوومەكان پێی گەش دەبنەوە، وە خوای پەروەردگار هەموو شتێكی پێ زیندوو دەكاتەوە.

أنس كوڕی مالك (ﷺ) دەفەرمووێت: جارێكیان لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بووین بارانمان بەسەردا باری پێغەمبەر (ﷺ) هەندێ لە جلەكانی هەڵدایەوە تا باران لاشەی تەڕ كرد، ووتمان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ وات كرد، فەرمووی: ((لأنّه حَديثُ عَهدٍ بِربِّه))[١٨٠].

زانای پایە بەرز ئیمامی النووي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرمووێت: واتە: باران بارین ڕەحمەتی خوای پەروەردگارەو تازە دروستی كردووە (تازە باراندوویەتی) بۆیە تەبەڕروكی پێ دەكرێت.

---

(١٧٩) الترمذي بنحوه، عن عائشة رضي الله عنها، كتاب الحج، باب: حدثنا أبو كريب، ٢٨٦/٣، برقم ٩٦٣، والبيهقي، ٢٠٢/٥، وصححه الألباني في صحيح سنن الترمذي، ٢٨٤/١، والأحاديث الصحيحة، ٥٧٢/٢.

(١٨٠) أخرجه مسلم، كتاب صلاة الاستسقاء، باب الدعاء في الاستسقاء، ٦١٥/٢، برقم ٨٩٨.

## ۞ بەدەست هێنان و داوا كردنی خێرو بەرەكەت بە شێوەیەكی ناشەرعی و نادروست بەم شێوانەی لای خوارەوەیە :

**یەكەم:** تەبەڕوك كردن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوای مردنی دروست نییەو ناشەرعییە، بەڵام لە دوو شتدا دروستە:

١ - باوەڕ پێبوون و گوێڕایەڵی كردن و شوێن كەوتنی، هەر كەسێك باوەڕی پێبێنێت و گوێڕایەڵی بكات و شوێنی بكەوێت، ئەوە بێگومان خێرو بەرەكەت و پاداشتی زۆرو بەختەوەری دونیاو دوارۆژ بەدەست دێنێت.

٢ - تەبەڕوك كردن بەو شتانەی كە بە لاشەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بووە، یان هی ئەو بووە، وەكو: موی لاشەی، جل و بەرگی، قاپ و قاچاغەكانی.

بەڵام جگە لەم شتانە دروست نییە تەبەڕوك بكرێت بە هیچ شتێكی، بۆیە شەرعی نییە تەبەڕك بكرێت بە گۆڕەكەی، وە خۆ ئامادەكردن مەبەستی زیارەتی گۆڕەكەی دروست نییە (واتە: شَدُّ الرِّحال) نابێت، بەڵكو خۆ ئامادەكردن و سازدانی زیارەت تەنها بۆ ئەم سێ مزگەوتە دەبێت (المسجد الحرام (كەعبەی پیرۆز)، والمسجد الأقصى (قودسی پیرۆز)، والمسجد النبوي مزگەوتی مەدینە)، بۆیە سوننەتە كاتێك كە موسوڵمانێك زیارەتی گۆڕەكەی پێغەمبەر (ﷺ) بكات ئەگەر لە مەدینەدا بێت، یان زیارەتی مزگەوتەكەی كردبێت پاشان زیارەتی گۆڕەكەی بكات، وە زیارەتی گۆڕەكەی بەم شێوەیە دەبێت: كاتێك دەچیتە ناو مزگەوتەكەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) دوو ركات سوننەتی سڵاوی مزگەوت دەكەیت (تحية المسجد)، پاشان دەچیت بۆ لای گۆڕەكەی و ڕوو دەكەیتە ئەو هۆدەیەی كە پێغەمبەری (ﷺ) تێدا نێژراوە بەلەسەر خۆیی و نەرموو نیانی و بە دەنگێكی نزم دەڵێیت: السَّلامُ عَلَيكَ يَا رَسُولَ الله، واتە: سەلامی خوات لەسەر بێت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، عبدالله كوڕی ئیمامی عمر (خوایان لێ ڕازی بێت) لەمە زیاتری نەدەوت، بەڵام ئەگەر لەمە زیاتر بڵێیت: ((السَّلامُ عَلَيكَ يا رَسُولَ الله، يا

خيرة الله من خلقه، أشهدُ أنّكَ رَسولُ الله حَقّاً، وأنّك قد بَلّغتَ الرِّسالة، وأدّيتَ الأمانَة، وَجاهَدتَ في الله حَقَّ جهاده، وَنَصَحتَ الأمَّةَ)).

واته: سەلامی خوات لەسەر بێت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەی باشترین دروست کراوی خوا، شایەتی ئەدەم کە تۆ پێغەمبەری خوایت (ﷺ) ، بەڕاستی پەمامی خوات گەیاند، بەڕاستی ئەو ئەمانەتەی لەسەر شانت بوو گەیاندت، بەڕاستی تێکۆشایت لە پێناو خوای پەروەردگاردا باشترین تێکۆشان، وە بەڕاستی بە جوانترین شێوە ئامۆژگاری ئوممەتەکەت کرد. ئەگەر ئەم زیادەیە بڵێیت هیچی تێد نییە چونکە ئەمانە هەمووی سیفاتی پێغەمبەرن (ﷺ)[181].

بەڵام نابێت لای گۆڕەکەی بپاڕێیتەوە بۆ ئەوەی گومانت وا نەبێت کە پاڕانەوە لای گۆڕەکەی وەڵام دەدرێتەوە، وە بە هیچ شێوەیەك داوای شەفاعەتی لێ ناکەیت، وە نابێت دەست و لاشەت بهێنێت بە سەر گۆڕەکەیدا وە نابێت نە گۆڕەکەی و نە دارو بەردو دیوارەکەی ماچ بکەیت، وە نابێت تەبەڕڕوك بکەیت بەو شوێنانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) دانیشتووە لەسەری یان نوێژی لەسەر کردووە، وە نابێت تەبەڕڕوك بکەیت بەو ڕێگایانەی کە بەسەریدا ڕۆیشتووە، وە ئەو شوێنانەی کە تێیدا وەحی بۆ سەر دابەزیوە، وە نابێت تەبەڕڕوك بکەیت بەو شوێنەی کە تیایدا لە دایك بووە یان شەوی لە دایك بوونی یان ئەو شەوەی کە شەو ڕەوییەکەی تێدا ڕویدا، وە تەبەڕڕوك ناکرێت بە ڕۆژی کۆچ کردنەکەی، وە جگە لەمانەش کە نە خواو نە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە شەرعیان دانەناوە[182].

**دووەم:** لەو تەبەڕڕوکانەی کە ناشەرعییە و دروست نییە: بریتیە لە تەبەڕڕوك کردن بە پیاوچاکان، موسڵمانی تەنها خوا پەرست ئاگاداربە کە تەبەڕڕوك بە خودی پیاوچاکان و شوێنەوارەکانیان و شوێنی عیبادەتەکانیان و شوێنی

---

[181] بڕوانە: مجموع فتاوى ابن باز في الحج والعمرة، ٥/٢٨٩.

[182] بڕوانە: التبرك: أنواعه وأحكامه، للدكتور الجديع، ص ٣١٥-٣٨٠

دانیشتن و گۆڕەکانیان ناکرێت و دروست نییە، وە خۆئامادەکردن و گەشت کردن و نوێژ کردن لای گۆڕەکانیان نابێت و دروست نییە، وە داوای پێویستی ناکرێت لای گۆڕەکانیان، وە دەست و لاشە هێنان بەسەر گۆڕەکانیان و مانەوەو تەبەڕوك کردن بە لە دایك بوونیان و جگە لەمانەش هیچیان دروست نین بەڵکو ناشەرعین، بۆیە هەر کەسێك ئەو کارانە بکات و مەبەستی نزیك بوونەوە بێت لێیان ئەوە بەڕاستی هاوەڵی گەورەی بۆ خوای پەروەردگار بڕیارداوە (الشّرك الأكبَر) واتە: باوەڕت وابێت کە پیاوچاکان زەرەرو زیان و سودیان بە دەستە، یان بەخشین و ڕێگری لێ کردنیان بەدەستە، بەڵام ئەگەر کەسێك ئەو کارانە بکات بە ئومێدی بەدەست هێنانی خێرو بەرەکەت لەلایەن خوای پەروەردگارە ئەوە بەڕاستی بیدعەیەك و کارێکی زۆر خراپی کردووە[١٨٣].

**سێیەم:** لە تەبەڕوکە ناشەرعیەکان: تەبەڕوك کردن بە شاخ و کێو و شوێنەکان، لەبەر ئەوەی تەبەڕوك کردن بەم شوێنانە پێچەوانەی مەنهەج و ڕێبازی پێغەمبەرە (ﷺ)، چونکە تەبەڕوك کردن پێیان هۆکارە بۆ بە گەورە زانینی ئەو شوێنانە، وە دروست نییە ئەو شوێنانە قیاس بکرێتە سەر بەردە ڕەشەکە (الحجر الأسود) و تەواف کردن بەدەوری کەعبەدا، چونکە ماچ کردن و سوڕانەوە بە دەوری کەعبەدا عیبادەتن و بەبەڵگەی قورئانی پیرۆز و سوننەت ئەو کارانە دەکرێت، وە جگە لەدەست هێنان بە (الحجر الأسود والركن اليماني من الكعبة) دروست نییە دەست بە هیچ شوێنێکدا بهێنرێت لەڕووی بەرەکەت و پیرۆزییەوە، چونکە بە یەکدەنگی زانایان پێغەمبەر (ﷺ) تەنها سەلامی لە هەردوو ڕوکنی اليَماني کردووە[١٨٤].

---

[١٨٣] بڕوانە: التبرك: أنواعه وأحكامه، للدكتور الجديع، ص ٣٨١-٤١٨.

[١٨٤] بڕوانە: إقتضاء الصراط المستقيم، لإبن تيميّة (رحمه الله تعالى)، ٢/٧٩٩.

زانای پایه بەرز إبن القیّم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: (لەسەر ڕووی زەویدا هیچ شوێنێك نییە (پارچە زەوییەك) دروست بێت ماچ بکرێت و سەلامی لێ بکرێت و تاوانی تێدا بوەرێت تەنها بەردە ڕەشەکەو ڕوکنی الیَمـانی نەبێت (الحَجَرُ الأسوَد والرّکن الیَماني مِنَ الکَعبَة)[١٨٥].

وە سەبارەت بە تایبەت مەندی مەککەی پیرۆز دەفەرمووێت: (لەسەر ڕووی زەویدا هیچ شوێنێك نییە کە پێویست بێت لەسەر هەموو موسوڵمانانێکی بە توانا بڕوات بۆ ئەویّ (بۆ حەج کردن) وە بەدەوریدا بسوڕێتەوە جگە لە کەعبەی پیرۆز).

وە زانای پایە بەرز إبن تیمیّة (ڕەحمەتی خوای لێبێت) سەبارەت بە سوڕانەوە بە دەوری جگە لە کەعبەی پیرۆزدا دەفەرمووێت: (وە سوڕانەوە بەو شێوەیە (بە دەوری هەرشتێك جگە لە کەعبەی پیرۆز) یەکێکە لە گەورەترین بیدعە حەرامەکان، بۆیە هەر کەسێك سوڕانەوە (الطّواف) بە دەوری هەرشتێك جگە لە کەعبەی پیرۆز بە دین بزانێت داوای تەوبەی لێ دەکرێت، ئەگەر تەوبەی کرد ئەوە باشە، ئەگەر تەوبەی نەکرد ئەوە دەبێت بکوژرێت)[١٨٦].

وە دەست و لاشە هێنان و ماچ کردنی (مقـامي إبـراهیم) و دارو بەردی مزگەوتی حرام (کەعبەی پیرۆز) دروست نییە (بە نییەتی تەبەڕوك)، وە دروست نییە زیارەت کردن و سەرکەوتن بۆ کێوی (الحـرّاء) بە مەبەستی نوێژکردن و بەدەست هێنانی خێرو بەرەکەت، وە کێوەکانی (ثَور، عَرَفَة، أبي قُبَیس، ثبیر)یش بەهەمان شێوە دروست نییە زیارەتیان بکرێت و نییەتی خێرو بەرەکەت پێیان هەبێت، وە دروست نییە زیارەتی کێوی (الطّـور) بکرێت و خۆ ئامادەکردن و

---

[١٨٥] بڕوانە: زاد المعاد في هدي خیر العباد، ١/٤٨.

[١٨٦] بڕوانە: مجموع فتاوى إبن تیمیة، ٢٦/١٢١.

گەشتی بۆ لا ساز بكرێت، بە نییەتی بەدەست هێنانی خێرو بەرەكەت، وە نابێت هیچ یەكێك لە دارو بەردەكان بە تەبەڕوك بزانرێت(١٨٧).

**هۆكارەكانی تەبەڕووك كردنی نادروست و ناشەرعی چین؟**

١ ـ نەزانی و نەشارەزایی لە دین.

٢ ـ زیادەڕەوی كردن لە پیاوچاكاندا.

٣ ـ خۆلێكچواندن بە هاوەڵ بڕیاردەران و بێباوەڕان.

٤ ـ بە گەورە زانینی شوێنەوارەكان وەكو (گۆڕ و دارو بەردو خۆڵ و ....).

**شوێنەوارە خراپەكانی تەبەڕووك كردنی نادروست و ناشەرعی زۆر زۆرن لەوانە:**

١ ـ بڕیاردانی شیركی گەورە، كە ئەمەش یەكێكە لە گەورەترین و ترسناكترین شوێنەوارە خراپەكانی تەبەڕووك كردنی نادروست و ناشەرعی، ئەگەر خودی ئەو كارە شیركی گەورە بێت، یان تەبەڕوك كردنی نادروست هۆكارە بۆ بڕیاردانی شیركی گەورە.

٢ ـ بڕیاردانی بیدعە.

٣ ـ كردنی جۆرەها تاوان و خراپەكاری.

٤ ـ كەوتنە ناو جۆرەها درۆ.

٥ ـ گۆڕینی دەقەكانی قورئانی پیرۆز و فەرمودەكانی پێغەمبەر (ﷺ)، وە لێكدانەوەیان بە شێوازێكی ناشایستەو نەویستراو.

٦ ـ فەوتانی سوننەتەكانی پێغەمبەر (ﷺ).

٧ ـ سەرلێشێوان بە هۆی كاری نەزانانەوە.

٨ ـ لەناو چوونی نەوەكان.

موسوڵمانانی خۆشەویست هەموو ئەم كارانە لە شوێنەوارە حەرام و خراپەكانی تەبەڕووك كردنی نادروست و ناشەرعیین.

---

(١٨٧) بڕوانە: التبرك: أنواعه وأحكامه، للدكتور الجديع، ص٤١٩-٤٦٤.

**هۆكارەكانی بەرگری كردن لە تەبەڕووك كردنی نادروست و ناشەرعی:**

١ - گەیاندن و بڵاو كردنەوەی عیلم و زانیارییەكی بە سوود.

٢ - بانگەواز كردن بۆ مەنهەج و ڕێبازی حەق و ڕاست.

٣ - لابردن و نەهێشتنی هەموو هۆكارەكانی زیادەڕەوی كردن و ئەو شوێنەوارانەی كە بە پیرۆز و گەورە دەزانرێن.

٤ - تێك شكاندنی هەموو هۆكارێك لەو هۆكارانەی كە خەڵكی بە تەبەڕوكیان دەزانێت[١٨٨].

زانای پایە بەرز شێخ الناصر السَّعدي (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە شەرحی (كتابُ التّوحيد) لە باسی (مَن تَبرَّكَ بِشَجَرَةٍ أو حَجَرَةٍ أو نَحوِهِما) دەفەرموێت: (واتە: ئەو كارە شیركە یان لە كردەوەی موشریكەكانە، زانایان یەكدەنگن لەسەر ئەوەی كە دروست نییە بە چاوی خێرو بەرەكەت بڕوانرێتە هیچ دارو بەردو مەزرگاو شوێنەوارەكان، چونكە ئەو كارە زیادەڕەوی كردنە تیایاندا، وە ئەم كارە وردە وردە سەر دەكێشێت بۆ پاڕانەوە لێیان و پەرستنیان كە ئەویش شیركی گەورەیە، وە ئەمەش گشتییە بۆ هەموو شتێك هەتا (مقامی إبراهيم) (حجرەكەی پێغەمبەر (ﷺ) و بەردی (بيت المقدس) وە جگە لەم شوێنە پیرۆزانەش).

بەڵام سەلام كردن و ماچ كردنی بەردە ڕەشەكە و (الرّكن اليماني) ئەمانە بەندایەتی كردنە بۆ خوای پەروەردگار، وە بە گەورە زانین و مل كەچ بوونە بۆی، كە ئەمەش ناوەڕۆكی عیبادەتە، ئەم كارە بەگەورە زانینی خوای پەروەردگارە و پەرستنە بۆی، بەڵام تەبەڕوك كردن بەو شتانە بە گەورە زانینی دروست كراوەكانەو پەرستنە بۆیان، وە جیاوازی نێوان ئەم دوو كارە، وەكو: جیاوازی

[١٨٨] بڕوانە: التبرك: أنواعه وأحكامه، للدكتور الجديع، ص ٤٨٣-٥٠٦. وە بڕوانە: اقتضاء الصراط المستقيم، لابن تيمية، ص ٧٩٥-٨٠٢، وە بڕوانە: كتاب التوحيد، للعلامة الدكتور صالح الفوزان، ص ٩٣.

نێوان پاڕانەوە لە خوای پەروەردگار کە ئیخلاص و خوا بە تەنها پەرستییە، وە پاڕانەوە لە دروست کراوەکان کە شیرك و هاوەڵ بڕیاردان وایە[١٨٩].

## ۞ باسی هەشتەم: بیدعە باوو بڵاوەکانی ئەم سەردەمە

بیدعە خراپ و باوەکانی ئەم سەردەمە زۆر زۆرن، لەو بیدعانە بە نموونە:

١ ـ **نییەت هێنان بە زمان و ووتنی بە دەنگی بەرز:** وەك موسوڵمانێك بڵێت: نییەتمە ئەم نوێژە ئەوەندە ڕکاتە دەکەم بۆ خوای پەروەردگار، یان بڵێت: نییەتم وایە ئەم ڕۆ بە ڕۆژوو ئەبم بۆ خوای پەروەردگار (فەرز بێت یان سوننەت)، یان بڵێت: نییەتم وایە دەست نوێژ دەگرم یان غوسڵی خۆم دەردەکەم، یان جگە لەمانە، موسوڵمانانی خۆشەویست نییەت هێنان بە زمان بیدعەیە، لەبەر ئەوەی نییەت هێنان بەم شێوەیە پێچەوانەی ڕێنمونی پێغەمبەرە (ﷺ)، وە لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ قُلْ أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٦﴾ ﴾ (الحجرات).

واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بڵێ: ئایا ئێوە خوای پەروەردگار لە ئاینی خۆتان ئاگادار دەکەن و پێی ڕادەگەیەنن، لە کاتێکدا خوای پەروەردگار زاناو شارەزایە بە هەرچی شتێك کە لە ئاسمانەکان و زەویدایە، بەڕاستی خوای پەروەردگار بە هەموو شتێك زاناو بە ئاگایە.

موسوڵمانی خۆشەویست نییەت شوێنی ناو دڵە، وەکارێکە پەیوەستە بە دڵەوە نەك بە لاشەوە، هەروەك زانای پایە بەرز إبن رجب (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: (نییەت: بریتیە لە مەبەستی ناو دڵەکان، بۆیە ئەو نییەتانەی کە لە ناو دڵدان واجب نییە بە زمان بوترێت لە هیچ جۆرێك لە عیبادەتەکاندا)[١٩٠].

---

[١٨٩] بڕوانە: القول السديد في مقاصد التوحيد، ص٥١.

[١٩٠] بڕوانە: جامع العلوم والحكم، ١/٩٢.

**٢ - ووتنی زیکرەکانی دوای نوێژە فەرزەکان بە جەماعی و بە دەنگی بەرز :**

موسوڵمانی خۆشەویست ئەوەی کە شەرعییە ئەوەیە هەر موسوڵمانێك ئەگەر زیکرێك لە سوننەتدا هاتووە بە تەنها و بە دەنگی نزم بیخوێنێت، هەر وەك پێغەمبەر (ﷺ) بەو شێوەیە زیکرەکانی دوای نوێژە فەرزەکانی کردووە، وەهاوەڵانی بەڕێزیشی بەو شێوەیە کردویانە، لە کاتێکدا ئەوان سوننەتەکانی پێغەمبەریان (ﷺ) بەو شێوەیە جێبەجێ کردووە، وە ئەوەی کە گومانی تێدا نییە ووتنی زیکرەکان بە جەماعی و بە دەنگی بەرز بیدعەیەو پێچەوانەی ڕێبازی پێغەمبەری خوایە (ﷺ).

٣ ـ **خوێندنی سورەتی** (الفاتحة) **بۆ گیانی مردووەکان**، یان خوێندنی دوای پاڕانەوە بۆ مردووەکان، یان خوێندنی لە کاتی مارە بڕیندا، هەموو ئەمانە بیدعەیەکی خراپن، چونکە لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) نەبووە، وە لە هاوەڵانی بەڕێزییەوە ئەم کارە نەهاتووە، لە کاتێکدا ئەوان شارەزاترین کەس بوونە بە حاڵی پێغەمبەر (ﷺ)، دەی کەوابوو کاتێك لەوانەوە ئەم کارە نەگێڕدراوەتەوە و ئەوان نەیان کردووە دەر دەکەوێت کە کارێکی بیدعەیە.

٤ ـ گێڕانی ماتەمینی لەسەر مردووەکان و خواردن دروست کردن بۆ ئەو خەڵکانەی کە دێن بۆ سەرخۆشی کردن لە کەس و کاری مردووەکە، وە بە کرێ گرتنی قورئان خوێنەکان بۆ قورئان خوێندن لەسەر مردوو، گومانیان وایە ئەم کارە سەرخۆشی کردنە لە کەسانی خاوەن مردوو، وە گومانیان وایە ئەم قورئان خوێندنە سوود بە مردووەکە دەگەیەنێت، هەموو ئەم کارانە بیدعەیەو خوای پەروەردگار هیچ بەڵگەیەکی لەسەر دروستێتی دانەبەزاندووە.

٥ ـ کردنی ویردە سۆفیەکان بە هەموو جۆرەکانییەوە کە پێچەوانەی ڕێبازی پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، جا ئەو پێچەوانە کردنە لە ڕووی ووتنی ویردەکەوە بێت، یان شێوەی، یان کاتەکەی بێت، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:

((مَن عَمِلَ عَمَلاً لَيسَ عَلَيهِ أمرُنا فَهُوَ رَدٌّ))[١٩١].

واتە: هەركەسێك كارێك بكات (عیبادەتێك) فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت بۆ كردنی، ئەوە ئەو كارە كارێكە وەرناگیرێت، بەڵكو دەدرێتەوە بەسەر خاوەنەكەیدا. وە جگە لەم بەڵگانەش كە بەڵگەن لەسەر نكۆڵی كردنی بیدعەو ترسان لێی[١٩٢].

٥ ـ خانوو دروست كردن بەسەر گۆڕەكانەوە، وە كردنیان بە مزگەوت، یان دروست كردنی مزگەوت بەسەر گۆڕەكانەوە و مردوو ناشتن تیایاندا، وە نوێژ كردن ڕوو بەڕووی گۆڕەكان، وە زیارەت كردنیان بە نییەتی بە دەست هێنانی خێرو بەرەكەت، وە تەوەسول كردن بە مردووەكان، وە نوێژ كردن لە لای گۆڕەكان بە مەبەستی خێرو بەرەكەت، وە زیارەت كردنی ئافرەتان بۆ گۆڕستان، وە ڕازاندنەوەو كردنی گۆڕەكان بە چراخان، هەموو ئەم كارانە بیدعەیە و كارێكی خراپن[١٩٣].

---

[١٩١] رواه مسلم، ١٣٤٣/٣، برقم ١٧١٨.

[١٩٢] **بڕوانە:** التحذير من البدع، ص٢٦.

[١٩٣] **بڕوانە:** كتاب التوحيد، للعلامة الدكتور صالح الفوزان، ص٩٤.

## ۞ باسی نۆیـەم: تەوبە کردنی کەسی بیدعەچی

موسوڵمانی خۆشەویست باش بزانـە و گومـان لـەوەدا نییـە کـە بیدعـەکردن ترسناکترە لە تاوان کـردن، هـەر کاتێـك تـاوان لـە بەندەیەکدا کۆببێتـەوە و ئـەو کەسە سوور بێت لەسەری ئەوە لـەناوی دەبـات، وەبیدعـە کـردن زیـاتر لـە نـاوی دەبات، هەروەك سُفيانِ الثّوري (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفـەرموێت: (البدعَــةُ أَحَبُّ إلى إبليسَ مِنَ المَعصيةِ؛ فإنَّ المَعصيةَ يُتابُ مِنها وَالبدعَةُ لا يُتابُ مِنها)[١٩٤].

واتە: بیدعەکردن خۆشەویـستترە لای شـەیتان (إبلــيس) لـە تـاوان کـردن، چونکە تاوان تەوبەی لێ دەکرێت بەڵام بیدعە تەوبەی لێ ناکرێت.

زانای پایە بەرز إبن تيميّة (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: (واتای (وَالبدعَةُ لا يُتابُ مِنها) ئەوەیە: کەسی بیدعەچی کاتێك دینێکی تـازەی داهێنـاوە کـە نـە خوای پەروەردگار و نە پێغەمبەر (ﷺ) بە دینیان دانەناوە، ئەو کارە خراپەی بـۆ ڕازێنراوەتەوە و بە کارێکی چاك و باشی دەزانێـت، بۆیـە هـەتا ئـەو بیدعەیـە بـە باش بزانێت ئـەوە هـەرگیز تەوبـەی لـێ ناکـات، لەبـەر ئـەوەی سـەرەتای تەوبـە بریتییە لەوەی کە مرۆڤ دەبێت بزانێت کـارێکی خراپـی کـردووە تـا تەوبـەی لـێ بکـات، یـان دەبێـت عیلمـی هـەبێت و بزانێـت کـە کـارێکی فـەرز یـان سـوننەتی فەوتاندووە تا تەوبەی لێ بکات، بۆیە هەتا ئەو بیدعەچییە ئـەو کـارە بیدعەیـەی لا باش بێت ئەوە هەرگیز تەوبەی لێ ناکات)[١٩٥].

پاشان فەرموویەتی: (بەڵام دەشێت کەسی بیدعەچی تەوبە بکات و تەوبەی لـێ دەوەشـێتەوە، ئـەویش بـەوەی کـە خـوای پـەروەردگار هیدایـەتی بـدات و ڕێنمونی بکات تا حەق و ڕاستی بۆ ڕوون دەبێتەوە، هەر وەك خـوای پـەروەردگار

---

[١٩٤] بڕوانە: شرح السنة، للبغوي، ١/٢١٦.

[١٩٥] بڕوانە: مجموع فتاوى شيخ الإسلام إبن تيمية، ١٠/٩.

هیدایەتی چەندین بێباوەڕ و مونافیق و كۆمەڵانی ئەهلی بیدەع و سەرلێشێواوانی داوە)[١٩٦].

وە فەرموویەتی: (ئەوەی دەڵێت: بە هیچ شێوەیەك تەوبەی كەسی بیدعەچی گیرا نییە، ئەوە بەڕاستی هەڵەیەكی گەورەی كردووە)[١٩٧].

وە هەروەها لە شەرحی ئەو فەرمودەیەی كە دەفەرمووێت: پەردە دراوەتە نێوان تەوبە و كەسی بیدعەچی، هەروەك أنسي كوڕی مالك (ﷺ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە، كە فەرمویەتی: ((إنَّ اللّٰهَ حَجَبَ التَّوبَةَ عَن صاحِبِ كُلِّ بِدعَةٍ))[١٩٨].

واتە: خوای پەروەردگار بەری تەوبەی گرتووە لە نێوان هەموو كەسێكی بیدعەچی.

واتای ئەم فەرمودەیە لە ووتەكەی پێشوی إبن تیمیە زۆر بە جوانی ڕوون بووەوە.

موسوڵمانی خۆشەویست بەڕاستی دەقەكانی قورئانی پیرۆز و سوننەت هەندێكیان ڕوون دەكەنەوە، وە خوای پەروەردگار ڕوونی كردۆتەوە بۆ بەندەكانی كە تەوبەی تەوبەكاران وەردەگرێت ئەگەر واز لە تاوانەكانیان بێنن و سوور بن لەسەر ئەوەی كە جارێكی تر نەگەڕێنەوە سەری، وە مافی خەڵكی بگێڕنەوە ئەگەر لەسەریان بوو، خوای پەروەردگار پاش ئەوەی باسی هاوەڵ بڕیاردەران و بكوژان و زیناكەران دەكات و پەیمانی پێیان داوە كە لە دوا ڕۆژدا

---

[١٩٦] بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ١٠/٩-١٠.

[١٩٧] بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ١١/٦٨٥.

[١٩٨] أخرجه الطبراني في المعجم الأوسط، ٨/٦٢، برقم ٤٧١٣ [مجمع البحرين في زوائد المعجمين. وقال الهيثمي في مجمع الزوائد: ورجاله رجال الصحيح، غير هارون بن موسى الفروي وهو ثقة، ١٠/١٨٩، وصحح إسناده الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة ٤/١٥٤، برقم ١٦٢٠، وذكر طرقه الأخرى.

سەرشـۆڕیان بکـات، فەرموویـەتی: ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ ﴾ (الفرقان).

واتە: مەگەر کەسانێك کە تەوبە دەکەن (پاش ئەنجام دانی ئەو تاوانانە) وە باوەڕی تەواو دێنن و کردەوەی چاکە دەکەن، ئا ئەو کەسانە خـوای پـەروەردگار کردەوە خراپەکانیان دەگۆڕێ بۆ کردەوەی چاکە، وە خوای پەروەردگار زۆر لـێ خۆش بوو زۆر بەبەزەییە[١٩٩].

وە هـــەروەها دەفـــەرموێت: ﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ ﴿٨٢﴾ ﴾ (طه ٨٢) .

واتە: دڵنیا بن بە ڕاستی من زۆر لێخۆش بووم لەو کەسەی کە تەوبە دەکات و باوەڕ دەهێنێت و کردەوەی چاکە دەکات، لەوەو دوا (تا دوا هەناسـەی ژیـانی) بەردەوام دەبێت لەسەر ئەو مەنهەج و ڕێبازە.

هەروەها خوای پەروەردگار فەرمویەتی: ﴿ ۞ قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾ (الزمر: ٥٣) .

واتــە: ئـەی پێغەمبـەر (ﷺ) بـە بەنـدەکانم بڵـێ: خـوای پـەروەردگار دەفەرمـوێت: ئـەی بەنـدەکانم ئەوانـەی کـە خۆیـان تووشـی تـاوان کـردووە و خراپەیان زۆرە، نا ئومێد مەبن لە ڕەحمی خـوای پـەروەردگار، چـونکە بەڕاستی ئەگەر ئێوە تـەوبەی ڕاست و دروست بکەن، خوای پەروەردگار لە هـەموو گونـاهو تاوانـەکانتان خـۆش دەبێـت، چـونکە بێگومـان ئـەو خوایـە زۆر لێخۆشـبوو و لێبوردەیە وە زۆر بە ڕەحم و بە بەزەییە.

---

[١٩٩] بڕوانە: تفسير القرآن العظيم لإبن كثير (رحمه الله)، ٦/١٢٤.

وە هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿ وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١١٠﴾ ﴾ (النساء).

واتە: هەر كەسێك خراپەیەك بكات (بەرامبەر بە خەڵكی) یان ستەم لە نەفسی خۆی بكات (لەوەودوا بە خۆیدا بچێتەوە) و داوای لێخۆش بوون لە خوا بكات ئەوە دەبینێت كە خوای پەروەردگار زۆر لێخۆش بوو و بە بەزەییە.

ئەم تەوبەكردنە گشتی یە و هەركەسێك لە كافران و موشریكان و بیدعەچییان و جگە لەوانیش لە كەسانی تاوانبار تەوبە بكەن، ئەگەر مەرجەكانی تەوبەیان تێدا بێت، خوای پەروەردگار تەوبەیان لێ وەردەگرێت، ولله الحمد.

## باسی دەیەم: زیان و شوێنەوارە خراپەکانی بیدعە:

بیدعە چەندین شوێنەوار و سەر ئەنجامی خراپ و ترسناك و زیانی لەناو بەری هەیە، لەو زیانانە:

١ ـ بیدعە سەردەكێشێت بۆ کوفر (بَرِيد الكُفر):

أبو هريرة (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە، کە فەرمویەتی: ((لا تَقُومُ السّاعَةُ حَتّى تَأخُذَ أمّتِي بأخذ القُرون قبلها شبرًا بشبر، وذراعًا بذراع" فَقيلَ: يا رَسولَ الله، كَفارِس وَالرُّوم؟ فقالَ: "وَمَن النّاسُ إلا أولئك))[٢٠٠].

واتە: قیامەت نایات هەتا ئوممەتەکەم (هەندێك لە ئوممەتەکەی) شوێنی رێگەو ڕێبازی پێش خۆیان دەکەون، بست بە بست و باڵ بە باڵ، ووترا ئەی پێغەمبەر (ﷺ) شوێنی رێگەو ڕێبازی قەومانی فارس و ڕوم دەکەون، فەرموی: ئایا کەسانی تر هەیە جگە لەوان؟ (لەو کات و سەردەمەدا فارس و ڕوم دیارترین و گەورەترین هێز بوونە).

وە أبوسعيد الخدري (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە، کە فەرمویەتی: ((لَتَتّبِعُنّ سَنَنَ من كان قبلكم: شِبراً بشبرٍ، وذراعاً بذراعٍ، حتّى لَو دَخَلُوا في جحرِ ضَبٍّ لاتّبعتُمُوهُم" قلنا: يا رسولَ الله، اليَهود والنّصارَى؟ قالَ: فَمَن))[٢٠١].

واتە: ئێوە ئەی موسڵمانان شوێنی گەلانی پێش خۆتان دەکەون: بست بە بست و باڵ بە باڵ، هەتا ئەوان بچنە ناو کونی بزن مژۆکەوە ئێوەش دەچنە ناویەو شوێنیان دەکەون، ووتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مەبەستت گاور و جولەکەیە کە ئێمە شوێنیان دەکەوین، فەرموی: بەڵێ ئەی کێی تر هەیە.

---

[٢٠٠] أخرجه البخاري، كتاب الاعتصام بالكتاب والسنة، باب قول النبي ﷺ: "لتتبعن سنن من كان قبلكم"، ٨/١٩١، برقم ٧٣١٩.

[٢٠١] متفق عليه: البخاري، كتاب الاعتصام بالكتاب والسنة، باب قول النبي ﷺ: "لتتبعن سنن من كان قبلكم"، ٨/١٩١، برقم ٧٣٢٠، ومسلم، كتاب العلم، باب اتباع سنن اليهود والنصارى، ٤/٢٠٥٤، برقم ٢٦٦٩.

٢ ـ بيدعە كردن واتە: درۆ هەڵبەستن بۆ خواى پەروەردگار بە بێ عیلم و زانيارى، موسڵمانى خۆشەويست كاتێك دەڕوانيتە سيرەى كەسانى بيدعەچى دەيان بينيت لە هەموو كەس زياتر درۆ بۆ خواى پەروەردگار و پێغەمبەر (ﷺ) هەڵدەبەستن، بۆيە خواى پەروەردگار ئاگادارى كردوينەتەوە كە قسەيەك نەكەين كە خواى گەورە نەيفەرموو بێت، هەروەك دەفەرموێت: ﴿ وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾ (الحاقة: ٤٤-٤٦).

واتە: ئەگەر پێغەمبەر محمد (ﷺ) هەندێ قسەو گوفتارى بۆ ئێمە هەڵبەستايە، ئەوە بەهێزو دەسەڵاتى خۆمان دەمان گرت، پاشان ڕەگى دڵيمان دەپچڕاندوو دەمان مراند.

وە پێغەمبەر (ﷺ) ئاگادارى كردوينەتەوە كە درۆى بەدەمەوە هەڵنەبەستين، بۆيە هەر كەسێك ئەو كارە بكات ئەوە هەڕەشەى لێ كردووە بە سزاى زۆر بە ئێش و تووند، هەروەك دەفەرموێت: ((مَن تَعَمَّدَ عَلَيَّ كَذِبًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ))[٢٠٢].

واتە: هەركەسێك بە دەستى ئەنقەست درۆ بەدەم منەوە هەڵببەستێت ئەوە با شوێنێك لەناو ئاگرى دۆزەخدا بۆ خۆى ديارى بكات.

٣ ـ كەسانى بيدعەچى ڕقيان لە سوننەت و كەسانى هەڵگرێتى، ئەمەش بەڵگەيە لەسەر ترسناكى بيدعە، زاناى پايە بەرز إسماعيل بن عبد الرحمن الصّابوني (ڕەحمەتى خواى لێبێت) دەفەرموێت: (نيشانەكانى كەسانى بيدعەچى ڕوون و ئاشكراو ديارە بەسەر خاوەنەكانيانەوە، لە ڕوونترين ودياترين نيشانەيان ئەوەيە كە زۆر ڕقيان لە سوننەت و هەڵگرانى دەبێتەوەو وە بەكەميان

---

[٢٠٢] متفق عليه من حديث أنس ﷺ: البخاري، كتاب العلم، باب إثم من كذب على النبي ﷺ، ٤١/١، برقم ١٠٨، ومسلم في المقدمة، باب تغليظ الكذب على رسول الله ﷺ، ٧/١، برقم ٢.

دەزانن)[٢٠٣].

٤ ـ بیدعەچی ئەو کردەوە چاکانەی کە بە بیدعە دەیان کات ڕەت دەکرێتەوە و وەرناگیرێت، لەبەر فەرمودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرمویەتی: ((مَن أحدَثَ في أمرِنا هذا مَا لَيسَ منهُ فَهُوَ رَدٌّ))[٢٠٤].

واتە: هەرکەسێك کارێك دابهێنێت و فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت بە زیادکردنی ئەو کارە ئەوە بەسەریدا دەدرێتەوەو لێی وەرناگیرێت.

وە لە گێڕانەوەیەکی تردا کە ئیمامی موسلیم گێڕاویتیەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((مَن عَمِلَ عَمَلاً لَيسَ عَلَيهِ أمرُنا فَهُوَ رَدٌّ))[٢٠٥].

واتە: هەرکەسێك کارێك بکات (عیبادەتێك) فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت بۆ کردنی، ئەوە ئەو کارە کارێکە وەرناگیرێت بەڵکو دەدرێتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا.

٥ ـ کەسانی بیدعەچی زۆربەی جار کۆتایی ژیانیان بە خراپە دەبێت (سُوءُ العاقبة)، لەبەر ئەوەی شەیتان دەیەوێت مرۆڤەکان لەیەکێك لەم کۆسپانەوە لە خشتە دەر بکات، کۆسپی یەکەم: دەیەوێت تاوانی شیرکی پێ ئەنجام بدات، ئەگەر ئەو بەندەیە لەم کۆسپە ڕزگاری بوو ئەوە لە کۆسپی بیدعە کردنەوە بۆی دێت و ڕێگای ڕاستی لێ دەشێوێنێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە بیدعە زۆر ترسناکترە لە تاوان کردن[٢٠٦]، هەروەك سفيانُ الثوري (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: (البِدعَةُ أَحَبُّ إلى إبليسَ مِنَ المَعصيةِ؛ فإنَّ المَعصيةَ يُتابُ مِنها

---

[٢٠٣] بڕوانە: عقيدة أهل السنة وأصحاب الحديث، ص٢٩٩.

[٢٠٤] رواه البخاري ٣/٢٢٢، برقم ٢٦٩٧، ومسلم، ٣/٣٤٤، برقم ١٧١٨.

[٢٠٥] رواه مسلم، ٣/١٣٤٣، برقم ١٧١٨.

[٢٠٦] موسڵمانی خۆشەویست بۆ زیاتر شارەزا بوون لە کۆسپەکانی تر، بڕوانە: مدارج السالكين، لإبن القيّم، ١-٢٢٢.

وَالبِدعَةُ لا يُتابُ مِنها)[٢٠٧].

**واتە: بیدعەكردن خۆشەویستترە لای شەیتان (إبلـیس) لـە تـاوان كـردن، چونكە تاوان تەوبەی لیّ دەكریّت بەلاّم بیدعە تەوبەی لیّ ناكریّت.**

**٦ ـ بیدعەچی بە پیّچەوانەوە لە قورئانی پیرۆز و سوننەت تیّدەگات، چونكە چاكە بە خراپە دەبینیّت، خراپە بە چاكە دەبینیّت، سوننەت بە بیدعە دەبینیّت، وە بیدعە بە سوننەت دەبینیّت، هەروەك** حذيفة اليماني (ﷺ) **دەفـەرمویّت:** (وَاللهِ لتفشُوَنَّ البِدَعِ حَتّى إذا تُرِكَ مِنها شَيءٌ قالُوا: تُرِكَتِ السُّنَّة)[٢٠٨].

**واتە: سویّند بیّت بە خوای پەروەردگار بیدعە زۆر بلاّو دەبیّتەوەو دەكریّت، هەر كاتیّك واز لـە بیدعەیـەك هیّنـراو نـەكرا دەلّیّن: سـوننەت ناكریّـت و وازی لـیّ هیّنراوە.**

**٧ ـ شـایەتی و گیّڕانـەوەی بیدعەچـی وەرناگیریّـت، زانایـانی شـارەزا (لـە فەرمودەناسان و شـارەزایانی شـەریعەت و بنـەماكانی ئـایین) یەكدەنگن لەسـەر ئەوەی ئەگەر كەسی بیدعەچی بە هـۆی بیدعەكەیـەوە بیّبـاوەڕ دەبـوو ئـەوە بـە هیچ شیّوەیەك گیّڕانەوەی (فەرموودەی) لیّ وەرناگیریّت، بەلاّم ئەو بیدعەچییەی كـە بـە هـۆی بیدعەكەیـەوە بـیّ بـاوەڕ نابیّـت (بـەلّكو تاوانبـارە) زانایـان ڕایـان جیاوازە، ئایا گیّڕانەوەی وەردەگیریّت یان نا؟ زانای پایە بەرز ئیمـامی** النّـووي (ڕەحمـەتی خـوای لیّبیّت) **ئـەو بۆچـونە پەسـەند دەكـات كـە گیّڕانـەوەی بیدعەچـی وەردەگیریّت ئەگەر بانگەواز نەكات بۆ بیدعەكەی، بەلاّم ئەگەر بانگەوازی دەكـرد بۆ كردنی بیدعە ئەوە گیّڕانەوەی فەرموودەی لیّ وەرناگیریّت**[٢٠٩].

---

[٢٠٧] **بڕوانە:** شرح السنة، للبغوي، ٢١٦/١.

[٢٠٨] أخرجه الإمام محمد بن وضاح، في كتاب فيه ما جاء في البدع، ص١٢٤، برقم ١٦٢، وانظر: آثـاراً في ذلك لابن وضاح في كتابه هذا ص١٢٤-١٥٦.

[٢٠٩] **بڕوانە:** شرح النووي على صحيح مسلم ١٧٦/١.

٨ ـ کەسانی بیدعەچی لە هەموو کەس زیاتر دەکەونە ناو فیتنەو ئاشوبەوە، خوای پەروەردگار ئاگاداری کردوینەتەوە تا نەکەوینە ناو فیتنەوە، هەروەك دەفەرموویت: ﴿ وَاتَّقُوا فِتْنَةً لَا تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنكُمْ خَاصَّةً وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٢٥﴾ ﴾ (الأنفال: ٢٥).

واتە: ئەی ئیمانداران خۆتان بپارێزن لە تاقی کردنەوەو بەڵایەك کە بە تایبەتی تووشی ئەوانەتان نابێت کە تاوان و ستەمیان کردووە، بەڵکو هەمووان دەگرێتەوە، وە باش بزانن کە خوای پەروەردگار سزاو تۆڵەی زۆر توندە.

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ ﴾ (النور: ٦٣).

واتە: با باش بزانن و بترسن ئەو کەسانەی کە سەرپێچی فەرمانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەن لەوەی کە تووشی فیتنەیەکی زۆر سەخت بن (تووشی شیرك و کوفر و دووری و بیدعە بن)[٢١٠]، یان با بترسن لەوەی کە تووشی سزایەکی زۆر بە ئێش بن.

موسڵمانی خۆشەویست ئایا هیچ فیتنەیەك هەیە لەوە ترسناکتر بێت کە پێچەوانەی سوننەت و فەرمانەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکرێت.

هەر بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) هانی موسڵمانانی داوە کە کردەوەی چاکە بکەن پێش هاتن و رووداني فیتنە بە گشتی و بە زۆری، هەروەك دەفەرموێت: ((بادِرُوا بالأعمالِ فِتَناً كَقِطَعِ اللّيلِ المُظلِم. يُصبِحُ الرَّجُلُ مُؤمِناً ويُمسِي كافِراً، أو يُمسِي مُؤمِناً ويُصبِحَ كافِراً يَبيعُ دِينَه بِعَرَضٍ مِنَ الدُّنيا))[٢١١].

---

[٢١٠] بڕوانە: تفسير القرآن العظيم للإمام ابن كثير (رحمه الله) ٦/٩٠.

[٢١١] رواه مسلم عن أبي هريرة ﷺ، كتاب الإيمان، باب الحث على المبادرة بالأعمال قبل تظاهر الفتن، ١/١١٠، برقم ١١٨.

واتـە: ئـەی موسـڵمانان دەسـت پـێش خـەری بكـەن لـە كردنـی كـردەوە چاكەكاندا پێش ئەوەی كە فیتنەیەكی یەكجار زۆر ڕووتـان تـێ بكـات بـە وێنـەی شەوێكی تاریك (چۆن تاریكی شەو هەموو شوێنێك دەگرێتـەوە بـە هـەمان شێوە فیتنەش هەموو خـەڵكی دەگرێتـەوە)، پیاوی وا هەیـە بـەیانی ئیمانـدارە كاتێك ئێوارەی بەسەردا دێت بێ باوەڕ دەبێت، پیاوی وا هەیە ئێوارە ئیمانـدارە كاتێك بـەیانی بەسـەردا دێـت بـێ بـاوەڕ دەبێـت، نهێنیەكـەی لەوەدایـە كـە: دینەكـەی دەفرۆشێت بە بەشێكی كەمی دونیا.

٩ ـ كەسی بیدعەچی هەستی بە كەم و كوڕی شەریعەت كردووە (پەنا بە خوای پەروەردگار) ئەگەر بە زمانیش وا نەڵێت، چونكە بە كردنی ئەو بیدعەیەی خۆی گێڕاوە بە شەرع دانەرو تەواوكەری دین، ئەم بیدعەچییە وادەكات! خوای پەروەردگاریش دینی تەواو كردووە و نیعمەتی تەواوی ڕژاندووە بەسەر ئیمانداراندا ، هەروەك خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ۞﴾ (المائدة: ٣).

واتە: ئەی موسڵمانان ئەمڕۆ دینم بۆ تەواوكردن و نیعمەتی خۆم ڕژاندووە بەسەرتاندا وەڕازیم لێتان (ئەی موسڵمانان) كە ئیسلام ئایینتان بێت و هیچ مەنهەج و ڕێباز و ئایینێكی تر نەكەنە ئایینی خۆتان.

· زانای پایە بـەرز ابن كثیر (ڕەحمـەتی خوای لێبێـت) لـە تەفـسیری ئـەم ئایەتـەدا فەرمویەتی : (ئەم نیعمەت و بەخششەی خوای پەروەردگار گەورەترین نیعمەت و بەخـشـشە بەسـەر ئـەم ئوممەتـەوە لـە كاتێكـدا ئاینەكـەی بـۆ تـەواو كـردوون، پێویستیان بە هیچ ئایینێك نییە جگە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام، وە پێویستیان بە هیچ پێغەمبەرێك (ﷺ) نییـە جگـە لـە پێغەمبـەری خۆیـان (ﷺ)، بۆیـە خوای پەروەردگار پێغەمبەری (ﷺ) گێڕاوە بـە دوایین پێغەمبـەر (ﷺ)، وە ڕەوانـەی

کردووه بۆ هەموو مرۆڤـ و جنۆکەکان، هیچ حەڵاڵێك نییە مەگەر ئەو حەڵاڵی کردبێت، وە هیچ حەرامێك نییە مەگەر ئەو حەرامی کردبێت، وە هیچ مەنهەج و ڕێباز و ئاینێك حەق و ڕاست نییە مەگەر ئەو ئاینەی کە پێغەمبەر (ﷺ) بە دینی زانیبێت، وە هەر شتێك ئەو هەواڵی پێدابێت حەق و ڕاستە هیچ درۆو دواکەوتنی تێدا نییە)[٢١٢].

وە خوای پەروەردگار هەموو شتێکی لە قورئانی پیرۆزدا ڕوون کردۆتەوە، هەروەك فەرمویەتی: ﴿ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿٨٩﴾ ﴾ (النحل: ٨٩).

واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئێمە قورئانی پیرۆزمان بۆ سەر تۆ دابەزاندووە کە ڕوون کەرەوەی هەموو شتێکە، وە مایەی ڕێنمونی و ڕەحمەت و مزگێنی یە بۆ موسڵمانان.

١٠ ـ کەسی بیدعەچی حەق و ڕاستی لێ گۆڕاوە بە هۆی کارە خراپەکانییەوە، لەبەر ئەوەی عیلم و زانیاری ڕووناکین و خوای پەروەردگار بە هۆیانەوە ئەو بەندانە هیدایەت دەدات کە خۆی ویستی لێیەتی، بەڵام کەسی بیدعەچی ئەو تەقوایەی لە دەست داوە کە بە هۆیەوە خاوەنەکەی دەتوانێت حەق و ڕاستی بدۆزێتەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا وَيُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢٩﴾ ﴾ (الأنفال: ٢٩).

واتە: ئەی ئیمانداران ئەگەر ئێوە تەقوای خوای پەروەردگار بکەن پارێزگاری لە سنوورەکانی بکەن، ئەوە خوای پەروەردگار بەرچاو ڕۆشنیتان پێ دەبەخشێت (تا بە هۆیەوە بتوان بە ئاسانی حەق و ڕاستی لە ناحەق جیا

---

[٢١٢] بڕوانە : تفسير القرآن العظيم للإمام إبن كثير (رحمه الله تعالى) ٣/٢٦ .

بكەنەوە)، وە خوای پەروەردگار هەڵەو تاوانەكانتان دادەپۆشێت و لێتان خۆش دەبێت، چونكە خوای پەروەردگار خاوەنی فەزڵ و ڕێزی گەورەو بێ سنوورە.

١١ ـ كەسی بیدعەچی دەبێت تاوانی خۆی و ئەو كەسانەی كە شوێنی بیدعەكەی دەكەون هەڵبگرێت، أبو هريرة (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بۆمانی گێڕاوەتەوە، كە فەرمویەتی: ((مَن دَعَا إلى هُدَى كانَ لَه مِنَ الأجرِ مثلُ أجورِ مَن تَبِعَهُ، لا يَنقُص ذلكَ مِن أجُورِهِم شَيئاً وَمَن دَعَا إلى ضَلالَةٍ كانَ عَلَيهِ مِنَ الإثمِ مِثلُ آثامِ مَن تَبِعَه، لا يَنقُصُ ذلكَ مِن آثامِهِم شَيئاً))[٢١٢].

واتە: هەركەسێك دەعوەو بانگەواز بكات بۆ ڕێگای ڕاست و ڕێنمونی چاك و جوان، ئەوە خێرو چاكەی بۆ هەیە بە وێنەی خێرو پاداشتی ئەو كەسانەی كە شوێنی دەكەون، بێ ئەوەی هیچ لە خێرو پاداشتی ئەو كەسانەی كە شوێنی دەكەون كەم ببێتەوە، وە هەركەسێك دەعوەو بانگەواز بكات بۆ ڕێگای خراپەو تاوانكاری و سەرلێشێواوی ئەوە خراپەو تاوانی بۆ دەنوسرێت بە وێنەی خراپەو تاوانی ئەو كەسانەی كە شوێنی دەكەون، بێ ئەوەی هیچ لە خراپەو تاوانی ئەو كەسانەی كە شوێنی دەكەون كەم ببێتەوە.

(دەی كەسی بیدعەچی كاتێك بیدعە دەكات و خەڵكیش فێری بیدعە دەكات با ئاگادار بێت و باش بزانێت كە هەر بیدعەیەك خەڵكی لێوەی فێر دەبن و دەیكەن هەموو تاوانەكەی بۆ دەنوسرێت بێ ئەوەی هیچ لە خراپەو تاوانی ئەو كەسەی كە شوێنی دەكەوێت كەم بكات).

١٢ ـ كەسی بیدعەچی بە هۆی كردنی بیدعەوە خۆی توشی نەفرەت (لَعنَة) كردووە، أنسي كوڕی مالك (ﷺ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە، دەربارەی ئەو كەسانەی لە مەدینەدا شتێكی تازەو خراپ دادێنن دەفەرمووێت:

---

[٢١٢] مسلم، كتاب العلم، باب من سن سنة حسنة أو سيئة ، ومن دعا إلى هـدى أو ضـلالة ، ٤/٢٠٦٠، برقم ٢٦٧٤.

((مَن أحدَثَ فيها حَدَثاً أو آوى مُحدِثاً فعَلَيه لَعنَةُ الله، وَالملائكة، وَالنّاسِ أجمَعين، لا يَقبَلُ اللهُ منهُ صَرفاً وَلا عَدلاً))[٢١٤].

**واته: هەركەسێك لە ناو شاری مەدینەدا كارێكی تازەو خراپ دابهێنێت ئەوە نەفرەتی خوای پەروەردگار و فریشتەكان و موسڵمانانی لیٚ بێت، وە فەرز و سوننەتی لیٚ وەرناگیرێت (واتە: بە تەواوەتی لێی وەرناگیرێت) .**

**زانای پایە بەرز ئیمامی** الشّاطبي **(ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: (ئەم فەرمودەیە گشتی یەو هەموو تازە داهێنراوێك دەگرێتەوە كە پێچەوانەی شەرعە، وە بیدعە یەكێكە لە خراپترین كارە تازە داهێنراوەكان)**[٢١٥].

**١٢ ـ كەسی بیدعەچی لە ڕۆژی دواییدا ڕێگای لیٚ دەگیرێت و ناهێلرێت بچێتە سەر حەوزی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ خواردنەوەی ئاوی سازگاری (كَوثَر)، سهل كوڕی سعد (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بۆمانی گێڕاوەتەوە، كە فەرموویەتی:** ((أنا فَرَطُكُم عَلى الحَوضِ مَن وَرِدَ شَرِبَ، وَمَن شَرِبَ لَم يَظمَأ أبَداً، وَلَيَرِدَنَّ عَليَّ أقوامٌ أعرِفُهُم وَيَعرِفُوني، ثُمَّ يُحالُ بَيني وَبَينَهُم))[٢١٦].

**واتە: مـن پێشتان دەكەوم بۆسەر حەوزی (كَوثَر) و چاوەڕێی ئەو موسڵمانانە دەكەم كە دێن بۆ ئەوەی لە ئاوی سازگاری (كَوثَر) بخۆنەوە، ئاوێكە هەر موسڵمانێك لێی بخواتەوە هەتا هەتایە تینوی نابێت، كۆمەڵە موسڵمانێك دێن**

---

[٢١٤] متفق عليه: البخاري، كتاب الاعتصام، باب إثم من آوى محدثاً، ١٨٧/٨، برقم ٧٣٠٦، ومسلم، كتاب الحج، باب فضل المدينة، ودعاء النبي ﷺ فيها بالبركة، ٩٩٤/٢، برقم ١٣٦٦

**موسڵمان خۆشەویست بۆ زیاتر شارەزا بوون لە واتای تەواوی ئەم فەرمودەیە بڕوانە:** عمدة القاري شرح صحيح البخاري (٤٠٨/٣٥)، وە شرح النووي على صحيح مسلم (٣١/٥)، وە عون المعبود (٣٠٧/٩)، وە تحفة الأحوذي (٤١٠/٥)، وە فيض القدير (٢٥/٦).

[٢١٥] **بڕوانە:** الاعتصام للشّاطبي، ٩٦/١ .

[٢١٦] متفق عليه: البخاري، كتاب الرقاق، باب في حوض النبي ﷺ، ٢٦٤/٧، ومسلم، كتاب الفضائل، باب إثبات حوض نبينا ﷺ وصفاته، ١٧٩٣/٤، برقم ٢٢٩٠

بۆسەر حەوزەکە تا ئاوی لێ بخۆنەوە، من ئەوان دەناسم و ئەوانیش من دەناسم، بەڵام ڕێگری لە نێوان من و ئەواندا دەکرێت و ناهێڵرێت بێنە سەر حەوزی (کَوثَـر) و لە ئاوی سازگاری بخۆنەوە.

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ((إنَّهم مِنّي، فَيُقالُ: إنَّكَ لا تَدرِي ما أحدَثُوا بَعدَك، فَأقُولُ: سُحقاً سُحقاً لِمَن غَيَّرَ بَعدِي))[٢١٧].

واتە: ئەوان لە ئوممەتی منن (موسڵمانن)، دەوترێت: تۆ نازانی ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوان دوای مردنی تۆ چییان داهێناوە (لە پاشگەز بوونەوە و کاری خراپە و بیدعە)، منیش دەڵێم: دووری بۆ ئەو کەسانە، دووری بۆ ئەو کەسانە، کە دوای مردنی من دینیان گۆڕی.

وە شَـقیقي کوڕی عبـداللە (ﷺ) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بۆمانی گێڕاوەتەوە، کە فەرمویەتی: ((يا ربِّ أصحابي أصحابي، فيقال: إنَّكَ لا تَدرِي ما أحدَثُوا بَعدَكَ))[٢١٨].

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: دەڵێم (ئەی پەروەردگار ئەوانە هاوەڵی منن، ئەوانە هاوەڵی منن (موسڵمانن و شوێن کەوتووی منن)، دەوترێت: تۆ نازانی ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوان دوای مردنی تۆ چییان داهێناوە (بیدعە).

أسماء کچی أبوبكر (رضي الله عنها) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((إنِّي عَلَى الحَوضِ حَتّى أنظُرَ مَن يَرِدُ عَلَيَّ مِنكُم، وَسَيُؤخَذُ ناسٌ مِن دُونِي فَأقُولُ: يا رَبِّ مِنّي وَمِن أمَّتِي فَيُقالُ: هَل شَعَرْتَ ما عَمِلوا بَعدَكَ وَاللهِ ما بَـرِحُوا يَرجُعُون على أعقابِهم))[٢١٩].

واتە: من لەسەر حەوزی (کوثر) دەوەستم و سەیر دەکەم تا بزانم کێ لە ئێوە (موسڵمانان) دێن بۆ لام، بۆیە کەسانێك دەیانەوێت بێن بۆ لام بۆ سەر

---

[٢١٧] رواه البخاري، كتاب الرقاق، باب في حوض النبي ﷺ ، ٢٦٤/٧، برقم ٦٥٨٣

[٢١٨] متفق عليه: البخاري، كتاب الرقائق، باب في حوض النبي ﷺ ٢٦٢/٧، برقم ٦٥٧٥، ومسلم، كتاب الفضائل، باب إثبات حوض نبينا ﷺ ، ١٧٩٦/٤، برقم ٢٢٩٧ .

[٢١٩] صححه الألباني في "صحيح الجامع" حديث رقم(٢٤٦٧).

حەوزی (کَوثَر) بەڵام ڕێیان لێ دەگیرێت و ناهێڵرێت بێنە سەری، منیش دەڵێم: ئەی پەروەردگارم ئەوانە لە منن و لە ئوممەتی منن (موسڵمانن)، لەو کاتەدا دەوترێت: ئایا دەزانیت ئەوانە دوای تۆ چییان کردووە، سوێند بێت بە خوای پەروەردگار بەردەوام پاشە کشێیان دەکرد لە دینەکەت و پاش گەز دەبوونەوە.

هەر بۆیە هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) إبن أبي مليكـة (رضي الله عنه) دەیفەرموو: ((اللّهمَّ إنّا نَعوذُ بِكَ أن نَرجِعَ عَلى أعقابِنا أو أن نُفتَنَ في دِينِنا))[220].

واتە: ئەی خوای پەروەردگارمان پەنات پێ دەگرین لەوەی کە پاش گەز ببینەوە و پاشەو پاش بکشێینەوە لە دینەکەمان، یان تووشی فیتنەو تاقی کردنەوە ببین لە دینەکەماندا.

١٤ ـ کە سانی بیدعەچی پشتیان هەڵکردووە لە یادو زیکری ڕاستەقینەی خوای پەروەردگار، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆز و لە سەر زمانی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) چەند ویردێکی تایبەتی بۆ داناوین، هەیانە تایبەتە بە نوێژە فەرزەکان، هەیانە تایبەتە بە بەیانیان و ئێواران، وە ویردی خەوتن و هەستان لە خەو، وە ویردو زیکری وا هەیە گشتی یە و تایبەت نەکراوە بە کاتێك و شوێنێکی دیاری کراوەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ ذِكۡرٗا كَثِيرٗا ۝٤١ وَسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا ۝٤٢ ﴾ (الأحزاب: ٤١-٤٢).

واتە: ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە زۆر یادی خوا بکەن (هەمیشە ناوی پیرۆزی خواتان لە یاد بێت لە دڵ و دەروونتاندا)، وە تەسبیحات و ستایشی بکەن (هەموو کاتێك) بە تایبەتی لە بەیانیان و کاتی دەمەو ئێواراندا (زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران). بەڵام کەسانی بیدعەچی پشتیان هەڵکردووە لە

---

[220] متفق عليه: البخاري، كتاب الرقائق، باب في حوض النبي ﷺ، ٧/٢٦٦، برقم ٦٥٩٣، ومسلم، كتاب الفضائل، باب إثبات حوض نبينا ﷺ وصفاته، ٤/١٧٩٤، برقم ٢٢٩٣.

خوێندنی ئەم زیکرە پیرۆزانە، جا یان بە هۆی سەرقاڵ بوون بە کردنی بیدعەوە، یان پشت هەڵکردنەکەیان بە هۆی گۆڕینی ئەو زیکرە شەرعیانە بە کردنی چەند زیکرێکی بیدعە، خۆیان بە بێ پێویست دەزانن لە کردنی ئەو زیکرانەی کە خوای پەروەردگار و پێغەمبەر (ﷺ) دایان ناوە، بۆیە بە هۆی ئەو بیدعانەوە پشتیان هەڵکردووە لە کردنی یادی ڕاستەقینەی خوای پەروەردگار[٢٢١].

١٥ ـ کەسانی بیدعەچی حەق و ڕاستی لە شوێن کەوتوانیان کپ دەکەن و دەیشارنەوە، وە خوای پەروەردگار هەڕەشەی نەفرەتی (لَعنَــة) لەو کەسانەو هاوشێوەکانیان کردووە، هەروەك دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ١٥٩ ﴾ (البقرة: ١٥٩) .

واتە: بەڕاستی ئەو کەسانەی کە بەرنامە و ڕێنموونییە ڕوون و ئاشکراکانی ڕەوانە کراوی ئێمە دەشارنەوە کە ناردوومانە (تا بۆ خەڵکی ڕوون بکرێتەوە)، دوای ئەوەی کە ڕوونمان کردۆتەوە بۆ خەڵکی لە کتێبەکاندا، ئا ئەوانە خوا نەفرەتیان (لەعنەتیان) لێ دەکات و نەفرین کارانیش نەفرەتیان لێ دەکەن (دوعای دووری ڕەحم و بەزەیی خوای پەروەردگاریان لێ دەکەن).

١٦ ـ بیدعە کردن دەبێتە مایەی دوور کەوتنەوەی خەڵکی لە ئیسلام، لەبەر ئەوەی کاتێك کەسی بیدعەچی بە هۆی ئەو بیدعەیەوە چەند کارێکی پڕو پوچ دەکات دەبێتە هۆکارێك بۆ ئەوەی دوژمنانی ئیسلام گاڵتە بە ئیسلام بکەن، لە کاتێکدا ئاینی پیرۆزی ئیسلام زۆر دوورە لەو کارانەی کە کەسانی بیدعەچی دەیکەن.

---

[٢٢١] بڕوانە: تنبيه أولي الأبصار إلى كمال الدين وما في البدع من الأخطار، للدكتور صالح بن سعد السحيمي، ص١٨٩ .

١٧ ـ كەسانی بیدعەچی ئوممەتی ئیسلامیان پارچە پارچە کردووە، چونکە خۆیان و شوێن کەوتوانیان بە هۆی بیدعەوە پارچە پارچەییان خستۆتە ناو موسڵمانانەوە، هەر بۆیە بە هۆی بیدعەو دوور کەوتنەوە لە سوننەت چەندین بەش بەش و کۆمەڵ کۆمەڵی جیاواز دەبینرێت، خوای پەروەردگار دەفەرموویێت:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍۚ إِنَّمَآ أَمْرُهُمْ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ ﴿١٥٩﴾ ﴾ (الأنعام: ١٥٩).

واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە ئایینەکەیان بەش بەش و پارچە پارچە کردوو بوونە دەستە دەستەو پارچە پارچە، ئەوە لە هیچ شتێکدا تۆ لەوان نیت، بەڵکو بەریت لێیان، بەڕاستی ئەوانە کارو باریان بۆ لای خوایە و تۆڵەی ئەو لادان و پارچە پارچەییەیان لێ دەستێنێتەوە، لەوەودوا خوای پەروەردگار هەواڵی هەموو ئەو کارو کردەوانەیان پێ دەدات کە ئەنجامیان دابوو.

١٨ ـ کەسی بیدعەچی کە بە ئاشکرا بیدعە دەکات، غەیبەت و باس کردنی دروستە، بۆ ئەوەی موسڵمانان لە خراپەی بیدعەکەی ئاگادار بن، چونکە ئەو کەسەی کە بە ئاشکرا بیدعە دەکات زیانەکەی زۆرترو ترسناکترە لە کەسێك کە تاوان دەکات، هەرچەندە غەیبەت کردنی موسڵمان بە پێی دەقی قورئانی پیرۆز و فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دروست نییە و حەرامە، بەڵام بۆ مەبەستێکی شەرعی دروستە غەیبەت بکرێت، **لەبەر یەکێك لەم هۆکارانە:**

**یەکەم:** ستەم کردن،: لەم کاتەدا دروستە کە ستەم لێ کراو سکاڵای خۆی باس بکات بۆ کاربەدەستان و فەرمانڕەوایان، یاخود بۆ قازی و دادوەر و بڵێ: فڵانە کەس ستەمی لێ کردووم یانماڵی خواردووم.

**دووەم:** پرس و ڕاوەرگرتن، ئەمیش بەوەی کەکەسێك بچێتە لای کەسێکی شارەزا لەدیندا و بڵێت ئەرێ فڵانە کەس چۆنە کە من بە تەمام کچی بدەمێ ،

يان خوشكمى بدەمىٚ، يان فلاّنە ئافرەت چوٚنە كە مـن بەتـەمام بيخـوازم، ياخود بوٚ پرسيار كردن دەربارەى هاوسێيەتى.

**سىٚيەم:** داواى يارمـەتى كـردن بـوٚ گـوٚڕينى خراپـە (مُنكَــر) وەلا دانـى نـا ڕەحەتيەك لە سەر موسولْمانێك، وەك ئەوەى كـە يـەكێك بـچێتە لاى كەسێك كـە دەسەلأتدارەو پێى بلێت كە فلاّنە كەس لە گەلْمدا خراپەو ئازارم دەدات وە ڕێگـە چارەيەكم بوٚ بدوٚزەرەوە.

**چـوارەم:** ئاگادركردنــەوەى موســولْمانان و ئاموٚژگــارى كردنيــان، بـوٚ خـوٚ پاراستن لەو كەسـانەى كـە خـراپن و نيازيـان گـلاٚوە و زەرەرو زيانيـان هەيـە بـوٚ موسولْمانان.

**پێنجەم:** باس كردنـى كەسێك كـە بـە ئاشـكرا تـاوانى لێبووەشـێتەوە وەك {جاسووسى كـردن و زينـاو مـەى خواردنـەوە و.....هتـد } لـەم كاتەشـدا تـەنها باسى ئەو تاوانەى دەكەيت و بەس.

**شەشەم:** پێناساندنى كەسێك ئەويش بە ديارى كردنى ئەو كەم و كوڕيانـەى كە لە ڕووى كەم ئەندامى و لە ش و لاريەوە ياخود ناوو شوٚرەتيەوە، وەك كوێرى و نەخوٚشى و شەلى و قەلْەوى و كەڕى...هتد نابێت لەمەدا مەبەسـتى پيـشاندانى كەم و كوڕى و سوكى ناوبراو بێت، بەلْكو دەبێت تەنها پێناساندنى بێت.

**حەوتەم:** باس كردنى كەسى بيدعەچى و تاوان كار: لەم كاتەدا تەنها باسى بيدعەكەى ياخود تاوانەكەى دەكەيت، وە هيچى تـر مەگـەر يـەكێك لـەو خالأنـەى پێشووى تێـدابێت، خـاتوو (عائيشة)ى دايكـى بـاوەڕداران (خـواى لـىٚ ڕازى بێـت) دەفــەرموێت: (جارێكيــان پيـاوێـك هــات بـوٚلاى پێغەمبــەر (ﷺ) ڕوخـسەتى لــىٚ خواست و ئەويش بە ڕێزەوە بە خێرهاتنى كرد و فـەرمووى لـىٚ كـرد، پاشـان كـە پياوەكە ڕوٚيشت پێغەمبەرى خواﷺ فـەرمووى: ( بــئس أخـــو العـــشيرة) واتـە: خراپترين بـراى هوٚزەكەيـە، هـەروەها دايكمـان (عائيـــشة) خـواى لـىٚ ڕازى بێـت

بۆمان دەگێڕێتەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمویەتی: (مَا أَظُنُّ فُلاَنًا وَفُلاَنًا يَعْرِفَانِ مِنْ دِينِنَا شَيْئًا)[٢٢٢].

واتە: گومان نابەم کە ئەم دوو کەسە هیچ دەربارەی دین بزانن.

هەروەها کەسی بیدعەچی کە زیادەیەك دەهێنێتە ناو دینەوە و خوا دەپەرستێت و عیبادەتی بۆ دەکات، بەڵام بە بۆچوون و هەواو ئارەزووی خۆی، بێ گوێ دانە فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ)، بۆیە لەم کاتەدا باس کردنی پاشملە (غەیبەت)ی واجبە، چونکە ئەوە بۆ پاراستنی دینە لە هەواو ئارەزوو، (وَلا غِيبَةَ لِأَحَدٍ مِن أَهلِ البِدَعِ) وەهەر کەسێك کە بیدعە دەکات باس کردنی بیدعەکەی غەیبەت نییە، کەواتە ئێستا ڕوون بووەوە بۆ بەڕێزت کە باس کردنی ئەو کۆمەڵانە غەیبەت نییە[٢٢٣].

القدحُ ليس بغيبةٍ في ستةٍ ... متظلمٍ ومعرفٍ ومحذرِ
ومجاهرٍ فسقاً ومستفتٍ ومن ... طلب الإعانة في إزالة منكرِ[٢٢٤]

١٩ ـ کەسی بیدعەچی شوێن کەوتووی هەواو ئارەزووی خۆیەتی، دژایەتی شەرع دەکات و لە شەرع لایداوە[٢٢٥].

٢٠ ـ کەسی بیدعەچی خۆی خستۆتە ئاستی شەرع دانەرەوە و خۆی چواندووە بە خوای پەروەردگار لە شەرع داناندا، چونکە بەس خوای پەروەردگارە کە دەتوانێت شەرع دابنێت و فەرمان بە بەندەکان بکات تا لەسەری بڕۆن و جێ بە جێی بکەن نەك هیچ کەسێکی تر[٢٢٦].

---

[٢٢٢] صحيح البخاري (٦٠٦٧).

[٢٢٣] بڕوانە: فتح الباري بشرح صحيح البخاري، لابن حجر، ١٠/٤٧١، ٧/٨٦.

[٢٢٤] بڕوانە: شرح العقيدة الطحاوية، لابن أبي العز، ص٤٣.

[٢٢٥] بڕوانە: الاعتصام للشاطبي، ١/٦١.

[٢٢٦] بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ١/٦١-٧٠.

# كۆتایی

لە كۆتاییدا داواكارم لە خوای پەروەردگار بۆ خۆم و سەرجەم موسڵمانان كە لەش ساغیمان پێببەخشێت و لێمان خۆش ببێت، هەموو لایەكمان دڵ پەیوەست بكات بە قورئانی پیرۆز و سوننەتەكانی پێغەمبەرەوە (ﷺ)، وە بمان پارێزێت لە تاوان و خراپەی هەموو بیدعەیەك، وە بەردەوامیمان پێببەخشێت، آمین.

بحمد الله

## ناوەڕۆك

ئیمامی أحمد (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرمووێت

بنچینەکانی سوننەت لای ئێمە بریتیە لە: دەست گرتن بەو ووتەو کارانەی کە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەری بوونە، وە شوێن کەوتنیان و واز هێنان لە بیدعە، چونکە هەموو بیدعەیەک سەرلێشێواویە، وە واز هێنان لە دوو بەرەکی ناکۆکی، وە دوور کەوتنەوە و دانەنیشتن لە گەڵ کەسانی شوێن کەوتووی هەواو ئارەزو و بیدعەچی، وە دوور کەوتنەوە لە موناقەشەو دەمە دەمێ کردن و دوو بەرەکی و ناکۆکی لە دیندا.

www.ba8.org

دیـــزاین

ژمارەی سپاردن (٣٤٦) ی پێدراوە

3500